# ژیانی فەقێ و دەنگی فەقێ

مەحمود عەزیز حەسەن



وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتی چاپ و بلاوكردنەوەی سلێمانی
زنجیرە (٥٦٦)

## یادنامەكانی ژیان

# ژیانی فەقێ و دەنگی فەقێ

نووسینی
مەحمود عەزیز حەسەن

سلێمانی ٢٠٠٨

## یادنامەکانی ژیان

# ژیانی فەقێو دەنگی فەقێ


**بابەت: بیرەوەری**

**نووسینی: مەحمود عەزیز حەسەن**

**تایپ: ئامۆژگار کەمال**

**نەخشەسازی: مەهدی ئەحمەد**

**نەخشەسازی بەرگ: جەبار سابیر**

**سەرپەرشتیاری چاپ: کەنعان خەلیل**

**چاپ: چاپی یەکەم سلێمانی (٢٠٠٨)- چاپخانەی شڤان**

**تیراژ: ٥٠٠ دانە**

**ژمارەی سپاردنی(٥١٠)ی ساڵی ٢٠٠٨ ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ**

ناونیشان

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

سلێمانی. گردی ئەندازیاران: ١٠٥ کۆڵانی: ٣٤ ژمارەی خانوو: ١٠

ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

## ( بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبانەوە )

## ( ژیانی فەقێو دەنگی فەقێ )

لە ساڵی ١٩٥٠ لە سەردەمی پاشایەتیدا لە یەکێك لە مزگەوتەکانی شاری سلێمانی فەقێ بوومو دەمخوێند، لەو کاتەدا لە پلەی (مستعد) موستەعی دا بووم، لەو سەردەمەدا فەقێ بۆ ئەوەی لە سەربازی رزگار بنو نەبن بە سەربازو هەم لە پێناوی بەرژەوەندیو خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیشدا لەلایەن دەوڵەتەوە پێویست کرابوو کە فەقێ بە پێی یاسا ئەبێ هەموو ساڵێك لەو بابەتو وانە تایبەتییانەی کە دەیانخوێندو پەیوەندار بوو بە ئایینەوە تاقیکردنەوە (امتحان)یان بدایە لەپۆلی یەکەوە (١-١٢) تا پۆلی دوانزە. ئەمە تاقی کردنەوەیەکی رەسمی ئاینیو یاسایی بوو لەلایەن میریو وەزارەتی ئەوقافەوە دانرا بوو، ئەمەش تایبەتمەندێتی فەقێکان بوو لە کوردستانی عێراقدا، لەو کاتەدا شوێنو ژینگەو خوێندنگای فەقێ کوردستانی عێراقو ئێرانیش بوو چونکە سنوور بەرهەڵست نەبوو بۆ فەقێ، فەقێی عێراقی ئەچوونە کوردستانی ئێرانەوە، ئەچوونە شارەکانی: سنە، سابلاخ، سەقز، پاوە، مەریوان، بانە.. تاد، بۆ خوێندن هەروەها چەندەها فەقێی کوردستانی ئێران بۆ خوێندن دەهاتنە کوردستانی عێراق، دەهاتنە خوێندنگاکانی: تەوێڵە، بیارە،

هەڵەبجە، پێنجوێن، سلێمانی، هەولێر، کەرکوک بەمجۆرە سنوور شکێن بوونو کەس ڕێگەی لێ نەدەگرتن ئەوکاتە سنوور وەك ئێستا لەلایەن دەوڵەتەوە بە توندی چاودێری نەدەکرا، ئەو کاتە (جەوازو پاسەپۆرت) بۆ فەقێ نەبوو، جا کە فەقێ هەموو بابەتو مادە تایبەتمەندەکانی خوێندو تەواوی کرد ئەوە ئەبێ بە مەلای دوانزە عیلم وەك وا باوەو مەشهوورە، تاقیکردنەوەکانیشیان لە زانیارییەکانی: (نحو، صرف، تەفسیری قورئان، فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ)، شەرع، اصولی فقە، منطق، بەلاغەو کەلامو عەقائد، فەلسەفەو فلکیات، ریاضیات.. تاد)دا بوو، کە ئەم زانیاریانە هەمووی پەیوەندییان هەبوو بۆ زانینو لێکدانەوەو روونکردنەوەی ئاینی ئیسلام، پرسیارەکانی تاقیکردنەوەکەش لەلایەن لیژنەیەکەوەدانرابوونو دەکران کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێ مامۆستایانی ئاینی کە بە شێوەیەکی رەسمی لەلایەن وەزارەتی ئەوقافەوە دانرابوون کە هەم وانەبێژی رەسمیش بوون.

بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە چاودێری نوێنەری ئەوقافو تەجنیدیش کە نوێنەری وەزارەتی بەرگری بوو ئامادە دەبوون، ئەم ئەزموونو تاقیکردنەوەیە لە هەموو لیوا (پارێزگا)ی ناوچەکانی کوردستانی عێراقدا ئەنجام ئەدراو لەلایەن فەرمانگەکانی ئەوقافیشەوە سەرپەرشتیو بەڕێوە دەبرا.

## (فەقێ و ژیانی فەقێ)

لەم بارەیەوە پێشەکی ئەتوانین بڵێین: فەقێ یان فەقێیەتی سێ پلەی هەیە (قوتابییەتی، سوختەیەتی، موستەعییەتی) ١- قوتابیەتی با بزانین چ لە رووی زمانی و چ لە رووی زاراوەییەوە واتاو مانای چییە؟ پلەی قوتابیەتی سەرەتاکەی دەس پێکردنی منداڵە لە تەمەنی (٦-٨) ساڵییەوە بە فێربوونی (ئەلف و بێ) واتە فێربوون و ناسینی وێنەو ناوی پیتەکانی خوێندن و نووسین، لە رووی زمانییەوە قوتابی لە وشەی (کتابی) عەرەبییەوە هاتووە، بەڵام ئەمڕۆکەو لەم سەردەمەی باروودۆخی پەرەسەندنی رۆشنبیری زمانی کوردیدا وا زانایان و شارەزایانی ئەم بوارەیە خەریکن و تێدەکۆشن و پوختامێژێکی زمانی کوردی بکەن، وشەی قوتابییان گۆڕیوە بە وشەی رەسەنی کوردی کە وشەی (فێرخواز- خوێندکار)ە واتە ئەوەی خەریکی فێری خوێندنە یا کاری خوێندنە.

هەروەها وشەی (قوتابخانە)شیان گۆڕیوە بە خوێندنگە، واتە شوێنی فێربوونی خوێندن، ئەمە لە رووی زمانییەوە، بەڵام لە رووی زاراوەیی قوتابییەوە چ لە کوردستانی عێراق یا ئێرانەوە- لە سەرەتای دەسپێکردنی منداڵانەوە بە فێربوونی خوێندن، لە پێشەوە دەس دەکرا بە فێربوونی وێنەو ناوو هێمای پیتەکانی (ئەلف و بێ)ی عەرەبی کە بریتین لە پیتەکانی حینجەکردن (حروف الهجاء العربیة) کە ئەمانە وێنەکانیانە (أ،ب،ت،ث، ج،ح،خ، د،ذ، ر،ز، س،ش، ص،ض، ط،ظ، ع،غ،ف،ق،ك،ل، م،ن،و،

ە،ي.) لەگەڵ خوێندنی ناوەکانیان بە کوردی: (هەمزە، یا ئەلف، بێ، تێ، ثێ، جیم، حێ، خێ، دال، ذال، ڕێ، زێ، سین، شین، صاد، ضاد،طێ، ظێ، عەین، غەین، فێ، قاف، کاف، لام، میم، نوون، واو، هێ، یێ.) هەروەها لەدوای فێربوونی وێنەو ناوی پیتەکان پێویست بوو قوتابی ئەم هێماو بزوێنانەش فێربێن: ناوەکانیان: (سەر، ژێر، بۆر، دووسەر، دووژێر، دووبۆر، هەڵکشاو، داکشاو، زەنە، گیرە= شەددە، مەددە، هێی خڕ، تێی خڕ.) کلێشەی وێنەی ئەم هێماو بزوێنانەش بۆ منالان لەسەرپەڕە کاغەزێك بەم شێوەیە دەنووسران:-

ـــَـــِـــُـــًـــٍـــٌـــّـــْـــ~ـــــ ه ـــــ ة

ــــــــع کە کاتێ قوتابی منداڵ ئەم نیشانانەی پیتو بزوێنانە فێر دەبوونو تەواویان دەکردو دەیان ناسین پاشان دەستیان دەکرد بە فێربوونو خوێندنی ووشەکانی سوورەتی (فاتیحە- الحمد) کە یەکەم سوورەتە لە قورئانی پیرۆز، بەڵام لە پێشەوە بە حینجە ووشەکان فێر دەکران نەك بە سایە، نموونەی فێربوونەکەیان بە حینجە بەم شێوەیە بوو، بۆ ووشەی (الحمد) پێیان دەوترا: (الف سەر ئە لام زەنە حی سەر حە میم زەنەحەم دال بۆردو ئەلحەمدو.- الحمد) بەم جۆرە وشەکانی تری سوورەتەکەو هەم سوورەتە وردەکانی تری جزمی (عمّ) لە قورئانی پیرۆز ئەمجا سوورەتی (الناس... والفلق...) هەتا جزمی عەممە تەواو دەبوو بەڵام تەنها جزمی عەممە بە حینجە ئەخوێنرا، ئەمجا دوای تەواو کردنی جزمی عەممە بە حینجەو

بەباشــی فێربوونیــان ســەر لــەنوێ بــۆ فێرکردنیــان بــە ســایە دەگەڕانــەوە بـۆ ســوورەتی فاتیحــە، بــە ســایە جزمــی عەممــەیان دەخوێند ئەمجا هەر بە سایە جزمی (تبارك‌و قد سمع الله)یان بەو شێوەیە لە خوارەوە بۆ سەرەوە ئەخوێند هەتا قورئانیان خەتم ئەکردو فێری خوێندنەوەی دەبوون بەباشی، ئا بەم جۆرە بەم منـــداڵو فێرخوازانـــەیان دەوت (قوتـــابی) ئەمـــەش واتـــا زاراوەییەکەی قوتابییە.

ئەمانــەش منــداڵی دێهاتــەکان‌و گەڕەکــەکانی دەوروپشــتی مزگەوتەکانی شارەکان بوون کە، دەنێردرانە بەر خوێندن، جا ئەم منداڵانـــە یـــان لـــەلای ســـوختەکانی فـــەقێی مزگەوتـــەکان دەیانخوێندو فێر دەبوون یا لەلای خوێندەوارو نیمچە مەلایەك کە دوکـانێکی بـۆ ئـەم مەبەسـتە دانـابوو پێـی دەوتـرا (حـوجرە) فێری خوێندن دەکران، منداڵ یا قوتابی زیرەك‌و مام ناوەندی لە مـــاوەی (٨-١٢) مـــانگ قورئانیـــان خـــەتم دەکـــردو فێـــری خوێندنەوەی دەبوون، هەشیان بوو لە ساڵ زیاتری دەخایاند، ئا بەو شێوەیە دەستووری خوێندنی منـاڵ ئاوهـا بـوو: لەپێشـەوە وشــەکانیان بــە حینجــە فێــر دەکــرا هــەتا وایــان لێ دەهــات کــە پیتــەکانی وشــەکان بەباشــی‌و تــەواوی بناســن، هــەروەها فێــری ناسینی وێنەی ئەو پیتانـەیان دەکردن کە هەندێ گۆڕانکارییان بەسەردا دێ لەناو وشەدا کە لە پێشی وشەوە بێ یا ناوەڕاست یـا کۆتـایی وشــە، ئــەمجا دوای ئــەم ناســینی پیتانــە بەســایە فێردەکـــران‌و دەیانخوێنـــد، ئەگـــەر وشـــەیەك (کەلیمـــە)یـــەك

خوێندنــەوەی بــە ســایە لــەلای قوتابییەکــە قــورس بوایــەو نەیتوانیایە بە باشی بیخوێنێتەوە بۆ ئاسانکاری خوێندنەوەکەی حینجەی دەکرد تاوەکو لەلای ئاسان دەبوو، چونکە وشەکان هــەموو عــەرەبی بــوونو زمــانی منداڵەکــە نــەبوون فێربــوونو خوێندنەوەی لەلای زۆر زەحمەتو ستەم بوو.

خەرجی ژیانو خۆراکو پۆشاکی ئەم منداڵانە ماڵی باوکیان بوو، هەموو بەیانیان لەماڵی باوکیانەوە هەریەکەو جزمەکەی هەڵ دەگرتو دەچوو بۆلای مامۆستاکەی یا لە مزگەوت لای فەقێ سوختەکان، یان لە حوجرە لەلای نیمچە مەلاکە، ئەمانە بەپارە دەیانخوێند بە مانگانە هەر یەکەو لە (٤٠-٥٠) فلسیان لەلایەن ماڵی باوکیانەوە دەدا بە مامۆستاکانیان، بەڵام ئەو مانگانەی فەقێ سوختەکان وەریان ئەگرت بۆ خودی خۆیان نەبوو، بەلکو بۆ خەرجی حوجرەکەیانو ژیانی خۆیانو مامۆستا وستەعییەکانیان بوو، بەڵام ئەو مانگانانەی کە ئەدران بە مامۆستای حوجرەی وەك دوکانەکە ئەوە بۆ مامۆستاکە خۆی بوو، بەڵام بەپێی ووشە زاراوایی فەقێ چ لە کوردستانی عێراقو چ لە کوردستانی ئێرانیشدا بەمانە نەدەوتران فەقێ، بەڵکو پێیان دەوترا قوتابی، هەرچەن لە واتا گشتییەکەی (فەقێ)ش دا لە بازنەی فەقێدا بوونو چونکە بنەڕەتو بنچینەی فەقێ بوون، کاتێك پێیان دەوترا فەقێ دوای خەتم کردنی قورئانو دەس کردنیان بە خوێندنی کتێبە وردەڵەکان لەلای موستەعی ئەمە

وەك گواستنەوەیەك بوو لە قۆناغ و پلەی قوتابی بۆ قۆناغ و پلەی (سوختەیی) ئەمجا پێیان دەوترا فەقێ.

٢- پلەی دووەم (سوختەیی) ئەمجا با بزانین سوختە لە رووی زمانی و زاراوەییەوە واتای چییە؟ و هۆی ناونانەکەی بەم وشەیە چۆنە؟ و چییە؟ وشەی سوختە دیارە لە (سوخت)ی فارسییەوە هاتووە، لێرەشدا بە واتا و مەبەستی هەڵبرژاو و گورج و گۆڵ و توند و تۆڵ دێ، چونکە ئەم پلەی فەقێیەتییەش پێویستی بە بە گورج و گۆڵی لە ئیش و کارکردنی لە حوجرەکەیاندا زۆر هەبوو، هەمیشە ئامادەبوو بۆ راپەڕین و بەجێ هاوردنی ئەو ئیشانەی کە لەلایەن مامۆستا موستەعییەکەیەوە پێی دەسپێردرا وەك لەوە دواتر باس دەکەین، سەرەتای دەسپێکردنی ئەم پلەی فەقێیەتییە ئەوەیە کە کاتێ قورئان فێربوون و خوێندنەکەیان تەواو کرد دەسیان دەکرد بە خوێندنی هەندێ نامە وەك (تۆمار) و هەندێ پەرتوکی وردەڵەی (نحو، صرف..) وەك کتێبی عەوامیلی جورجانی و تەسریفی زنجانی، ئا لێرەوە ئەمە ئەبێتە پلەی سەرەتای سوختەی فەقێیەتی هەتا دەگەنە کاتی خوێندنی پەرتوکی (جامی و سیووتی لە زانیاری نحو..)دا کە ئەمەش دەبێتە سەرەتا بۆ پلەی موستەعییەتی.. سوختە لەلایەن (مستعد) موستەعییەوە لە حوجرەی مزگەوتدا جێگەی خوێندنی پێئەدرا، واتە موستەعی بەشێوەیەکی کاتی وەك خاوەنی حوجرە بێ وابوو، چونکە ئەو شوێنی خوێندنی ئەدا پێی و دەرسی پێ ئەوت، و لە حوجرە لای ئەم ئەیخوێند، ئەرکی

کارەکانی حوجرە لە مزگەوتدا هەمووی لەسەر شانی سوختە بوو، هەموو بەیانیان و نیوەڕوان و ئێواران چایان لێ ئەناو قۆریەوپیاڵەو قاپ و قاچاخی چێشتیان ئەشۆرد، گسکی ژووری حوجرەکانیان ئەدا، ئەمجا لە دوای نان و چایی خواردنی بەیانی مامۆستا موستەعییەکەی سوختەکەی بانگ ئەکرد کە کتێبی وانەکەی بهێنێ و بێت وانەکەی پێ بڵێت، شێوەی دانیشتنی سوختەکە لەبەردەم مامۆستاکەیدا ئەبوو هەردوو چۆکی دابدایەو کتێبە دەرسەکەی لەبەردەمیدا دابنایە، ئەمجا مامۆستا موستەعییەکەی کە وانەکەی پێ ئەوت و بۆی لێك ئەدایەوە پێی ئەوت تێگەیشتی؟ ئیتر سوختەکەیش هەموو جارێ ئەبوو بیوتایە (بەڵێ قوربان) بەڵکو مامۆستاکەی بیوتایەو نەیوتایە (تێگەیشتی) ئەو خێرا خێرا ئەیوت بەڵێ قوربان ئەمە داب و نەریتی ڕێزگرتنی فەقێ بوو لە مامۆستاکانیان، هەر بە هەمان شێوەو شێواز فەقێی موستەعیش کە وانەکەی دەخوێند لە خزمەتی مامۆستای گەورەی وانەبێژو ئیمامی مزگوتدا ئەبوو ئەمیش وەك سوختەکە بیوتایە بەڵێ قوربان. ئەمە نەریتێکی گشتی فەقێیەتی بوو لە هەموو کوردستانی عێراق و ئێرانیشدا.

جا کە فەقێی سوختە لەدوای ئەوەی کە خوێندنی وانەکەی لای مامۆستاکەی تەواو دەکردو لێی دەبووەوە ئەبوو قەواعیدو ڕێسای وانەکەی لەبەر بکات، ئەمجا بۆ ئەم کاری لەبەر کردنە هەڵئەستا و کتێبەکەی ئەگرت بەدەستیەوەو دەچووە هەیوانی مزگەوتەکەو بە پێوە کتێبەکەی ئەگرت بەدەستیەوە. ئەمجا لە

درێژایی هەیوانەکەدا لەم سەر بۆ ئەوسەری وەکو پیاسە کردن هاتوچۆی دەکردو وانەکەی لەبەر ئەکردو بەدەنگی بەرز ئەیووتەوە، ئەوانەی دراوسێی مزگەوت بوونایە گوێیان لە دەنگی بوو.

ئەمەش نمونەو شێوازێکی چۆنیەتی فێرکردنی قەواعیدو رێسای (مشتقات)ی کەلیمەی عەرەبی بوو لە زانیاری سەرف (عیلمی صرف)دا لە سەرەتای فێربوونیانەوە لە پەرتوکی(تصریفی زنجانی) فەقێیەکە بەدەم هاتو چۆکەیەوە لە هەیوانی مزگەوتەکەدا دەیووت( ئەرێ بابە کەی بابم (ضرب)ە فیعلی مازبیە (ضرباً) مەسدەریەتی تا تەحویلی خەربەن نەکەی بۆ لای (خەربە) بۆ تۆ حاسل نابێ مەعنایەك لە مەعنا مەقسوودەکان ئەویش وەکو لێدان بێ لە زەمانی رابوردوودا.) من بۆ خۆم ئەم شێوە دەربڕین‌و تەعبیرەیەم چاك لە بەر بوو، بەلاَم بە راستی نەمئەزانی (ضرب) فیلعی مازییە یانی چی، مەصدەر یانی چی، تاتەحویلی نەکەی یانی چی، مەعنا مەقسودەکان یانی چی؟!) نەم ئەزانی مەبەست لەمە چیەو بۆ چی ئەبێ بیزانم؟! تا گەیشتمە سەرەتای موستەعییەتیم ئەوجا ئەمانەم بەرە بەرە بۆ روون دەبوەوەو تێی دەگەیشتم.

ئەمجا فەقێی سوختە هەموو رۆژێ دوای نوێژی عەسران نانی گەرەکی مزگەوتەکەی خۆیان راتە ئەو ماڵانەی کە سەر بەمزگەوتەکەیانەو پیاوانیان بۆ نوێژ کردن دەهاتنە ئەوێ نانیان

دەچـنییەوە، ئێـوارانیش لـەدوای نوێـژی مـەغریب لـەو ماڵانـەی کەوەك مووچە بۆیانیان بڕیبووەوە دەچون چێشتیان دەهێنا.

ژیان و خۆراك و خەوتنی ئەم سوخنانە لەگەڵ موستەعییەکانی حوجرەی مزگەوتەکانـدا بوون، هـەروەها بـە هـەمان شـێوەش لـەو خوێندنگەی دێهاتە گەورانەی کە مەلا چاکی موستەعی خـوێنی هەبوایـە سـوختەو موسـتەعی خـۆراك و خـەوتن و هەڵسـوکەوتیان پێکەوە بوو.

سـوختە بەچاکی خزمـەتی مامۆسـتا موسـتەعییەکەی ئـەکرد: گسکدانی حوجرەکە، قاپ و قاچاغ شتن، نان تەڕکردن، چا لێنـان، نـان چـنینەوە، چێشـت هـاوردنی لـە ماڵەکانـەوە.. تـاد، ئەمانـەی هـەموو ئامـادە ئـەکردوو ئـەی هـاوردە بـەر دەسـتی مامۆسـتا موستەعییەکەی، ئەمەش تەنها لەپێناوی ئەوەدا بوو کە دەرسـی پـێ ئـەووت، موسـتەعی لـە حـوجرەدا هـیچ ئیشـێکی لـەم جـۆرە ئیشانە نەدەکرد، مەگەر تەنها ئەوە نەبێ کە کاتـێ شـەکرو چایان نـەدەما دەچـوە بـازاڕ خـۆی دەیکـڕی، چـونکە پـارەی خـەرجی حوجرەکەیان لە گیرفانی ئەمدا بوو، هۆی کار نەکردنەکەی یەکـەم نەریتێکی فەقیەتی بوو، دووەم چونکە ئەمیش وەك ئـەو لـە کـاتی خۆیدا رۆڵـی سوختەیی دیوەو ئێستە لـەو قۆناغەیـە تێپـەڕ بوەو گەیشـتۆتە پلـەی موسـتەعییەتی، واتـە ئامـادە بـوونی بـۆ پلـەی کۆتـایی خوێنـدن و گەیشـتنی بـە پلـەی مەلایـەتی و تـەواو کردنـی خوێنـدن، کـە ئەمـە وەك دەسـتورو یاسـاو نـەریتێکی فەقیـەتی و

مەلایـــەتی وابـــوو لـــە کوردســـتانی باشـــوردا چ لـــە عێـــراق‌و لـــە کوردستانی ئێرانیشدا، لە راستیدا ئەرکی سوختە زۆر گران بووە

٣- پلـەی (مسـتعد) موستەعی، بـابزانین واتـا زمـانی زاراوەی ووشـــەی (موســـتەعی) چی‌یە؟ووشـــەکە لـــە بنەرەتـــدا عەرەبییـــە (مستعد) اسمـی فاعیلـه لـه (اسـتعد یسـتعد اسـتعداد).وه لـه بـابی (اسـتفعال) ه بـەواتاو مەبەسـتی خـۆ ئامـادە کـردن‌و بـەرەو چـون‌و گەیشـــتنیەتی بـــە پلـــەی مەلایـــەتی‌و کۆتـــایی هـــاوردن بـــە خوێندن،فـــەقێ موســـتەعییەکان لـــەلای مـــەلا چـــاك‌و وانـــە بێژ(مدرس)ی مزگەوتـەکانی گەرەکـەکانی شـار د ەیانخوێنـد، یـان لە خوێندنگەی ئەودێهاتە گەورانەی کە مـەلای وانـە بێـژی بـاش‌و موستەعی خوێنی هەبوایە دەیانخوێند.

دەسـپێکردن‌و ســەرەتای پلـەی موســتەعیش لـە خوێنــدنی پەرتووکی (جامی‌و سیوطی) لـە نـەحودا بـوو یـا جـاری وابـوو بـە پێی شوێن‌و زانیاری مامۆستا لە پـەرتوکی (فەنناری) لـە عیلمـی مەنتیقـداو لـە کتێبـی (مـوغنی موحتـاج‌و ئیعانـە) لـە شــەرعدا دەسـتی پـێ ئـەکرد، هــەتا دەگەیشــتنە دواپلــەو پــەرتووکی خوێندن‌و ئاخر ماددەی خوێنـدن کـە دیـاری کـراوو دانـرا بـوو بـە پەرتووکی (تـەهزیب- تهذیب) کـە دانـەری مەتنەکـەی مامۆسـتای زانای بەڕێزو بـەناوبانگ (سـەعدی قـەفتازانی)یـە، شەرحەکەیشـی هی مامۆسـتای زانـاو بـەرزو بـەنامی‌ی کـورد (شـێخ عەبدولقادری موهــاجیره)، ئــەمجا کــە ئــەم موســتەعییانە هــەموو زانیارییــە ئایینییەکانیان تـەواو کـردو کۆتاییـان بـە خوێنـدنی هـاورد کـە بـە

خوێندنی ئەم پەرتووکی تەهزیبە دانراوە هەوڵ دەدەن کە لەلای مەلا چاکو وانەبێژێك (مدرسی دینی)یەکی ناودار ئیجازەی مەلایەتی وەربگرنو ببن بە مەلای (١٢) دوانزە عیلم وەك وا بەناوبانگە، هەم لەلایەن میریشەوە ئەبوو بە رەسمی (١٢) دوانزە ئیمتیحانیان بدایە لە ماوەی (١٢) ساڵداو بڕوانامەی وەزارەتی ئەوقافیشی بە رەسمی وەردەگرتو بەوجۆرە لە خزمەتی سەربازی کردن رزگاری دەبوو.

ئا بەم جۆرە فەقێی موستەعی دوو ئیجازەی هەبوو، یەکەم ئیجازەی مەلایەتی کە لەلای مەلایەك وەری دەگرت ئەمەیان نارەسمی بوو، دووەم بڕوانامەی تاقیکردنەوەی پۆلی (١٢)ی سەر بە وەزارەتی ئەوقاف ئەمەیان رەسمی بوو بەڵام تەنها بۆ عەفو کردنیان بوو لە خزمەتی سەربازی ئەم شەهادەیان لەمە زیاتر هیچ تەقدیرو نرخێکی نەبوو بۆ مەبەستی دامەزراندنیان لە فەرمانگەکانی دەوڵەتدا هەتا نە بۆ ئیمامەتی (بەرنوێژی کردن)یش.

## کورتە باسێکی چۆنیەتی ئیجازە وەرگرتنی موستەعی

موستەعی وەك لە پێشەوە وتمان کاتێ کە خوێندنەکەی تەواو کرد لەو مامۆستایەی کە خۆی بیەوێت ئیجازەی لەلا وەربگرێت داوا ئەکات ئیجازەی مەلایەتی بداتێ، ئەمیش لەدوای راوێژو لێکۆڵینەوەیەك، کە بڕیاری تەواوی بدایە بە ئیجازە پێدانەکە دەوڵەمەندان و کەسانی دەسڕۆیشتووانی گەڕەکی خوێندنگەو مزگەوتەکەی ئاگادار ئەکرد بۆ خەرجی و مەسرەفی کڕین و ئامادەکردنی (جبەو مێزەرو چی پێویستییەکی تری ئاهەنگی ئەم جۆرە موناسەبەتە گرنگە، ئەمجا کە بڕیاری یەکجارەکی و یەك لایەنی درا لەسەر ئیجازە پێدانەکە چی فەقێی سوختەو موستەعی مزگەوتەکان و خوێندنگەکانی ئەو دەوروبەرو نزیکانە هەبوایە ئاگادار ئەکران و بانگ ئەکران بۆ ئاهەنگ گێڕان کە فلان موستەعی لە فلان مزگەوت ئیجازە وەرئەگرێت. ئەمجا دوو سێ رۆژ لەپێش ئیجازە وەرگرتنەکەدا بەهۆی ئەم موناسەبەیەوەکە موناسەبەیەکی خۆشی و شادی نواندنە فەقێکان دەستیان دەکرد بە نواندنی ئاهەنگگێڕان و بەزمی هەڵپەڕکێ و سروود و گۆرانی وتن. بەڵام رۆژی وەرگرتنی ئیجازەکە زوربەی مەلاچاکانی خوێندنگەکان و پیاو ماقووڵان و بەڕێوەبەری فەرمانگەی ئەوقاف و هەندێ لە فەرمانبەرانی تری میری و گەلێ لە پیاو ماقووڵانی گەڕەکیش لەوانەی ئەرکی مەسرەفەکەیان لەسەر شان گرتبوو، هەروەها کەسانی تریش ئامادە دەبوون، ئەمجا وتاری بەرنامەی ئیجازەنامەکە دەخوێنرایەوە، شەربەت و شیرینی دەگێڕدراو

دەخورایەوەو، دوای تەواو بوونی ئەمانە مامۆستای ئیجازەدەر یان خودی خۆی ئیجازەنامە (بڕوانامە) پێدانەکەی دەخوێندەوە، یان خوێندنەوەکەی دەسپارد بە مەلایەکی تر، سا یا لەبەر پایەداریو بەرزی جێگای ئەو مامۆستایە بوو، یان لەبەر ئەوەبوو خاوەنی وەرعو خواناسیو تەمەنداری بوو، یا لەبەر پلەی بڵندی زانیاریو دانایی.. ئەو مامۆستایە بوو، ئەمەش نەوازشو ناسکیو نواندنی ڕێز لێنانێکی تایبەتمەند بوو بۆ ئەو مامۆستاو مەلا گەورانە.

هەروەها مامۆستای ئیجازەدەر یان خودی خۆی جبەکەی دەکردە بەر موستەعییەکەو مێزەرەکەیشی ئەبەست بەسەریەوە یاخود جبەو مێزەرەکەی لەبەردەم مامۆستایەکدا دادەناو داوای لێ ئەکرد کە ئەو ئەم کارە بەجێ بهێنێت، ئەمەش دیارە هەم نواندنی ڕێز لێنانێکە بۆ ئەو مامۆستایە لەبەر ئەو هۆیانەی لە پێشەوە باسمان کرد، ئەمجا موستەعییەکە بانگ دەکراو ئەچووە بەردەم مامۆستاکەو بە پێوە ڕادەوەستا ئەمیش بەناوی خواو سوپاسیەوە جبەکەی ئەکردە بەریو مێزەرەکەی ئەبەست بەسەریەوە، ئەمجا ئیتر موستەعییەکە دەستی ئەو مامۆستایەی ماچ دەکرد، دوای ئەوە یا لەگەڵ هاوڕێیەتی هاوڕێیەکی خۆیدا لەگەڵ مامۆستایەکدا ئەکەوتە تەکیو بەڕیز بە هەموو ئامادەبووەکاندا دەگەڕاو تەوقەو دەس ماچ کردنی لە تەکیاندا دەکرد، هەتا دەگەیشتە لای مامۆستا ئیجازەدەرەکەی خۆی دەستی ئەمی زیاتر لە جارێك ماچ ئەکرد. چونکە بەم ئیجازە

پێدانەی نرخ و ڕێزێکی تایبەتی داوە پێی و بووە بە گۆشەیەکی مێژووی ژیانی. ئەمجا دوای تەواو بوونی مەراسیمی ئاهەنگەکە ماموستاکەی چەن ئامۆژگارییەکی گرنگی موستەعییەکەی دەکرد دەربارەی هەڵس و کەوت و چۆنیەتی بەسەربردنی ژیان لەگەڵ خەڵکی داو هەمیشە پێویستە ڕێز لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بگریت.. هەرگیز فەرموودەکانی خوای گەورەو پێغەمبەر (د.خ) فەراموش نەکات و بیکات بە چرایەکی زۆر روونـاك بـۆ بەردەوامبوونی لەسەر ڕێبازی پیرۆزی ئاینی ئیسلام.. ئیتر لەدوای دوو سێ ڕۆژ خوا حافیزی لە ماموستاکەی و هاوڕێیان و دۆستانی فەقێ و ماموستایان و ناسیاوانی دەکرد یا بەرەو ماڵی باوکی ئەڕۆیشتەوە یان بەرەو ئەو گوندە دەچوو کە بووە بە مەلایان و لەوەپێش لەگەڵیان گرێ بەستەو بڕیاری داوە، خۆ ئەگەر ئەوەی نەبوایە ئەبوو بکەوتایەتە هەڵپەو هەوڵدان بۆ ئەوەی لە گوندێ یا لە مزگەوتێکی شارەکاندا دابمەزرێت ئەگەر دەستی بکەوتایە بۆ ئەوەی لەوێدا ببێ بە ئیمام و پێش نوێژی خوێنیان یان بە وانەبێژو وانەی بە موستەعییان بووتایە، ئەمجا خۆ ئەگەر ئەو گوندە یا ئەو مزگەوتەی وەچنگ نەکەوتایە ئەوا دەچووە ریزی هەزاران لە بێکاران و ژیانێکی پڕ لە ئەشکەنجەو ئاڵۆزو تاڵی ناهەمواری ئەچەشت، چونکە لەو سەردەمەدا میری پاشایی هیچ دەربەست و شوورێکی ژیانی توێژە کۆمەڵایەتییەکانی نەبوو.

واتای هەندێ وشەو بابەت وەك (فەقێ، مەلا، مریشكە رەشە، چنگە پوول، سەلكە سابوون... تاد)

١- وشەی فەقێ: لە چییەوە هاتووە؟

فەقێ وشەكە عەرەبییەو لە وشەی (فقية يفقه فقيهاً)وە هاتووە (فقيه) لەسەر وەزنی (فعيل)ەو ئیسمی فاعیلەو بەمانای زاناو تێگەیشتوو دێ، لە رووی زاراواییەوە فەقێ بەواتای زانا دێ بە شتە وردەكارییەكان كە لەژێر هەستی بینینی چاودا نین، بەڵكو بە بیرو هۆش‌و زیهن فەرمانە شەرعییەكان دەزانێ وەك عیبادات- نوێژ- رۆژوو- زەكات.. یا یاسای مامەڵەی كڕین‌و فرۆشتن. نیكاح‌و تەڵاق.. هەموو ئەحكامە شەرعییەكان‌و هەروەهاش زانا بەو زانیارانەش كە پەیوەندییان هەیە بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە وەك (زانین)ی (نحو، صرف، بەلاغە، مەنتیق، حیساب، دەستوورو بەڵگەكانی شەرع (اصول فقه).. تاد) فەقێ واتا زانا بە ئەحكامە شەرعییەكان‌و زانینەكانی تریش.

٢- مەلا: وشەی مەلا لە (ملأ يملأ)وی عەرەبییەوە هاتووە كە بە كوردی واتای (پڕە) دەگەیەنێ، جا لەبەر ئەوەی كە مەلا مێشك‌و بیرو هۆش‌و ئەندێشەی پڕ بووە لە زانین‌و هەموو زانیارییە ئاینییەكان ئەخوێنێ‌و ئەیانزانێ‌و بە شێوەیەك پڕ بووە لە زانیارییە شەرعییەكانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام‌و زانایە بە هەموو ئومووری فەرمانە شەرعییەكانی. بەم هۆیەوە پێی وتراوە مەلا.

٣- راتبە: یا راتبەی فەقێ: ئەمە چەند جۆرێکی هەبوو، وەك راتبەی نان چنینەوەی ماڵان. یا راتبەی کەرەو رۆن، یا راتبەی پارەو دانەوێڵە لە لادێکاندا.. تاد، راتبەی کەرە لە بەهارانداو لە گوندەکانی کوردستانی چی عێراقو ئێراندا باو بوو، با لە پێشەوە بزانین وشەی (راتب یا راتبە) کە وشەیەکی عەرەبییە واتای چییەو بۆچی ئەمەیان داناوەو بەکارهێناوە بۆ داواکردنی نان چنینەوەو کەرەو... هتد؟! وشەی راتبە واتا مووچە مووچەی مەعاش مووچەی ژیان، بۆیە ئەم وشەیان هەڵبژاردووەو داناوە لەبەر رێز گرتنی زانایانو رێبازی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، بۆ ئەوەی لە شێوەی سواڵکەرو سواڵ کردنی جیابکەنەوە کە ئەمەیان سووکایەتییەکی تێدایە، بەڵام راتبەی فەقێ وەك مافێکی رەوای خۆیان بێ وابوو، وەك قەرەبوویەك لە بریتی بەردەوامبوونیان لەسەر خوێندن هەتا زەکاتیشیان پێ ئەشیا چونکە بەردەوامبوونیان لەسەر خوێندن کۆسپو تەگەرەبوو لە رێگەی کار کردنیانو بەخێوکردنی خۆیاندا چونکە لە دواڕۆژدا ئەمانە ئەبن بە مەلاو خزمەتی گەشەپێدانی ئاینی پیرۆزو موسڵمانان دەکەن، بەڵام سواڵکردن یا سواڵکەر لە بەرامبەریدا شتێك یا خزمەتێك نییە کە سواڵکەرەکە بیگەیەنێ بە کۆمەڵانی خەڵکی موسڵمانان لەبەر ئەوە وشەی راتبەیان بۆ داناوە وەك حەقێکی رەوابێ بۆ فەقێکان وابووە، وشەکە رێز لێنانێك بووە بۆیان، هەتا ئەو خەڵکانی ماڵو گوندانەی کە راتبەیان لێ دەکردن ئەیانوت: حەقو رەوای خۆیانە کە یارمەتییان بدرێت، لەم

بارەیـــەوە هــیچ کــات تەگــەرەو بەرهەڵســتکاری‌وناڕەزاییان ای نەدەگرتن، بەڵام ئەمەیان لە ڕووی هەندێ سواڵکەردا دەگرت.

٤- جـۆری بــەرگ‌و پۆشــاکی فــەقێ: لــەو ســـەردەمەی فەقێیەتیـــدا بــە ســـوختەو موســـتەعییەوە بـــەرگی فـــەقێ لـــە کوردستانی عێـراق‌و ئێراندا، کـەواو سـەڵتەو دەرپـێ و کراسـی فەقیانــەداری بلــووری ســپی بــوو، مێــزەری سەریشــیان کــڵاوو جامەدانەبوو، بەڵام مێزەری خەڵکانی تـر بە گشتی لـەو عەیامـەدا بـە زۆرینـە مشـکی بـوو کەمایەتییـەکی کـەمیش لـە تەمەنـدارو بازرگـــانی دەوڵەمەنـــد هـــەبوون جامانـــە بەســـەر بـــوون بـــەڵام جیاوازییـەکی هەبوو لەگەڵ هـی فـەقێ، وە بـەو بەرگـەوە هـەر کـە دەبینران هـەموو کـەس دەیزانـی کـە ئەمانـە فەقێن‌و ئاوهـا دیـاری بوون.

لـەو سـەردەمەدا فـەقێ لای هەنـدێ خـەڵکان‌و کەسـان بەچـاوی ڕێـزو پیرۆزەوە سـەیر دەکـران‌و، دەیـانوت: فـەقێ فریشـتەی سـەر زەوین بەتایبەتی لە لادێیەکاندا.

٥- پشووی فەقێ: لەم بارەیەوە فـەقێ ڕۆژانـی سـێ شـەممەو هەینـی‌و مانگـی ڕەمـەزان وانـەیان نەدەخوێنـد بـەڵکو ئـەو ڕۆژانـەو ئـەو مانگـە پشـوو حەوانـەوەیان بـوو، بۆیـە فـەقێ لە بەهاراندا لـە ڕۆژانـــی ســـێ شـــەممەدا بـــۆ گەمـــەو یـــاری دەچـــوونە قـــەرداغ‌و دەرەوەی شـــار لـــە مێـــرگ‌و ســـەوزەڵانی‌و نەرمانییەکانـــدا ئـــەم یارییانـــەیان دەکـــرد. (کەوشـــەك، ســـێباز، گـــورز گورزێنـــە، تـــۆپ تۆپێن..تـاد) لـە زستانیشـدا لـە شـەوانی پشـووی سـێ شـەمواندا

فەقێی هەندێ مزگەوت دەچوون بە دیدەنیو میوانی فەقێی مزگەوتێکی تر، لەوێ دوای چاخواردنەوە دەس دەکرا بە هەندێك یاری تایبەتمەندی خۆیان وەك: پاشاپاشایانە یان گەڕەلاوژەی نوکتەو گۆرانی وتنو یا کلاوێن.. ئەمانە کاتی پشوودانو نەخوێندنی وانەیان بوو.

٦- مریشکەڕەشە: ئەمەش وەك لە پێشەوە باسم کرد کە سەرەتای خوێندنی منال دوای فێربوونی پیتەکانی خوێندن دەسیان دەکرد بە خوێندنی سوورەتە وردەکانی (جزمی عەممە) لە قورئانی پیرۆز، جا کاتێ کە منالە قوتابییەکە لە خوێندنەکەیدا ئەگەیشتە سوورەتی (النصر) کە لە کۆتایی سوورەتەکەوە ئەفەرموێ (انە کان توابا) مامۆستاکەی ئەیوت مریشکە رەشە سەوابە (ثواب)ە بۆ مامۆستاکەبابە، واتە مریشکە رەشە خێرە بۆ مامۆستا، ئەمە وا دەگەیەنێ و وا دیار بووە لە راستیشدا هەروا بووە لەو سەردەمەدا هەرە زۆرینەی مامۆستایانی ئاینی ژیانیانیان زۆر لە کەمو کوڕیو کوێرەوەریدا بووە، ئەم شتانەیان لەبەر ژیانە تاڵەکەیان هێناوەتە مەیدان، بەلام سیفەتی مریشکەکە بە وشەی رەشە زیاتر هاوسەنگو هاودەنگو لەباریەتی تاد هی سپی، یا زەرد یا کونجە.. ئەگینا مامۆستاکە هەر مریشکێك بێ وەری گرتووە، گرنگ لای ئەو خودی مریشکەکە بووە نەك رەنگەکەی!!.

٧- سەلکە سابوون: ئەمیش دیسان کە منالی قوتابی کە دەگەیشتە سوورەی (الماعون) لە کۆتایی سوورەتەکەدا

ئەفەرموێ (ويمنعون الماعون) مامۆستاکەی ئەیوت بهێنە سەلکێ سابوون: ئەمەشیان کە رێکخستووە هەر لەبەر نەبوونی و ناهەمواری ژیانیان بووە، وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

٨- چنگە پوول: هەر بە هەمان شێوە منالی قوتابی کە لە خوێندنەکەیدا گەیشتووەتە سوورەی (الفیل) کە ئەمیش لە کۆتاییەکەیدا کە کۆتایی سوورەتەکەیە ئەفەرموێ (کعصف مأکول) مامۆستاکەی ئەیوت: بهێنە چنگێ پوول، لەو رۆژگارەدا (٢٠ یا ٣٠) فلست ورد بکردایەتەوە بە فلس واتە یەك فلسی تاکە پوول، ئەوە پڕ چنگێ ئەبوو قوتابی ئەیبرد بۆ مامۆستاکەی، لە راستیدا ئەم دیاردانەی خوێندنی سەرەتاییە لەو سەردەمەدا لە دێهاتەکاندا هەبوون، من خۆم ئەمانەم بۆ مامۆستا بردووە، چونکە لەو عەیامەدا لە لە سەدا نەودو هەشتی خەڵکانی نەخوێندەوار بوون، زۆر جاران کەس و کاری منالە قوتابییەکە وەك مام، خاڵ، پوور یا خزمو خەڵکانی تریش لێیان دەپرسی و دەیانوت: گەیشتوویتە مریشکە رەشە یا بە تەعبیرێکی تر ئەیانوت مریشکە رەشەت خوێندووە؟! هەروەها پرسیاری تریان بۆ سەلکە سابوون یا چنگە پوول، ئەمانە لە بیرمە لە (لادێ)کاندا باو بوون.

# ژیانی فەقێ

لــە پێشــەوە ژیــانی خــواردنو خــەوتنو بــەرگو پۆشــەنی قوتابیمــان دەس نیشــان کــردو روونمــان کــردەوە، کــە هــەموو ژیانیـان لەسـەر مـاڵی باوکیانـەو خوێندنەکەیشـیان بـە پارەیـەو مانگانــە ئــەدەن بــە مامۆســتاکانیان، بــەڵام ژیــانی فــەقێکانی ســوختەو موســتەعی لــە ئــەوان جیــاوازترە، ئــەمان ژیانیــان لــە حـوجرەی مزگەوتەکاندایـەو لەسـەر خـەڵکانی گـەڕەکی مزگەوتـە، بەڵام بەپێی کەمو زۆرییان لە حوجرەو خوێندنگەکانی مزگـەوتو دێهاتەکانــداو بــەپێی دەسڕۆیشــتنو خزمــەتکردنی ماڵــەکانی گەڕەکـەکانی مزگـەوتو بایـەخ پێـدانیان جیـاوازی لـە نێوانیانـدا هەبوو، مزگەوتی وا هەبوو حوجرەکەیلە (٣-٤) موستەعیو (٢-٣) سـوختەی هـەبوو، مزگـەوتیش هـەبوو لـە حوجرەکەیـدا یـەك موســـتەعیو یـــەك ســـوختەی هـــەبوو، هەنـــدێك مزگـــەوتو خوێندنگــەیش هــەبوو کــە مەلاکــەیان چــاكو بایــەخ پێــدراوو بەناوبانگ بوو (١٠-١٢) فەقێی موستەعیو (٨-٩) سـوختەیان هــەبوو، ژیــانی تــا رادەیــەك جیــاوازی تێــدا هــەبوو، ئــەم جــۆرە خوێندنگەیــە چــەندەها حــوجرەی تێــدا هــەبوو، حــوجرەی ئــەم مزگـەوتو خوێندنگایانـە بەشـێوەی مەبەسـتی جیاجیـا لـەکاتی دروســـتکردنی مزگەوتەکـــەدا رەنگیـــان بـــۆ داڕێـــژراو دروســـت دەکــران، وەك حــوجرەی فــەقێ خوێندنگــەی وای هــەبوو (٣-٤)

حوجرەی هەر بۆ فەقێ کە کاتێ فەقێکانی زۆر بوونایە، حوجرەی وانەبێژ، حوجرەی مەلای ئیمام، ژووری ئازووخەی فەقێ، ژووری شتومەك و پێویستییاتی مزگەوتەکە خۆی، ژووری مجەور،.. تاد، بەم شێوەیە مزگەوتەکان ئەم حوجرانەی تێدابوو، بۆ شوێنی خەوتن و دانیشتن و حەوانەوەو خوێندنیان..، بەڵام سەرچاوەی ژیانیان واتە خەرجی و خۆراك و بەرگ وپۆشاکیان وەك لە پێشەوە ئاماژەم بۆ کرد بە شێوەیەکی کورت بەم شێوەیە بوو:-

١- نان چنینەوە: ئەمە فەقێ سوختەکانیان لە دوای بانگ و نوێژ کردنی عەسر هەر یەکەو بە ماڵەکانی گەڕەکی مزگەوتەکانی خۆیاندا دەگەڕان، ئەمەش وەك داب و نەریتێکی فەقێیایەتی وابوو چ لە کوردستانی عێراق و ئێرانیشدا نانیان دەچنییەوە، کە سوختەکان دەچوونە بەردەرگای هەر ماڵێك بە دەنگی بەرز دەیانوت: (راتبەی فەقێ رەحمەتتان لێبێت)، ئیتر خەڵکانی خاوەن ماڵەکەش گوێیان لە دەنگەکەی دەبوو خێرا نانێکیان بۆ ئەهێنا، کەم و زۆری نانی فەقێکان بە پێی کەم و زۆری ژمارەی ماڵەکانی گەڕەکەکە و کەم و زۆری ژمارەی فەقێکانیش بەو رێژەیە بوو، حوجرەی مزگەوتی واهەبوو هەموو ئێوارەیەك نزیکەی (٤٠-٥٠) نانیان هەبوو ئەمە شێوەیەکی مام ناوەندی بوو، هینی واش هەبوو لەوە زیاتر یان لەوە کەمتری هەبوو، وەك وتمان بەپێی زۆرو کەمی ماڵەکان و فەقێکان، زۆربەی فەقێی مزگەوتەکاننانەکەیان لە خۆیان زیاد بوو، جاری وا بوو (١٠-١٢) نانیان لە پێویستی خۆیان زیادبوو ئەمەیان دەفرۆشت لەو

سالانەی (٤٩-٥٠) دا نانێکیان ئەدا بە یەك فلس لەمەودوا بە دوو فلس ئەمجا دوای ئەوەش لە سالانی (٥٢-٥٤) بوو بە (عانەیەك) واتە چوار فلس، ئەم نانە وشکییە، بەشێك بوو لە سەرچاوەی ژیانیان.

٢- بەشێکی تریان (چێشت) بوو، ئەم دەسکەوتەشیان: هەندێك مالی دەولەمەن و دەسرۆیشتوو کە هامووشۆیان بەردەوام بۆ نوێژو جەماعەت لەگەل مزگەوتدا هەبوو ئا لەم مالانەوە چێشتیان وەردەگرت و دەیان هێنا، وەك مووچەیەکی هەمیشەیی بۆ فەقێکانیان بڕیبووەوە، فەقێ سوختەکان دوای بانگ و نوێژی مەغریب دەچوونە ئەو چەند مالە دەولەمەندانە سا لە (٢-٣) مال بوایە بەپێی کەم و زۆری مالەکان و هەم فەقێکانیش وەك لە پێشەوە وتمان چێشتیان دەدانێ و دەیان ئەهێناوە بۆ حوجرەکەیان، بەلام لەو سەردەمەدا چێشتەکانی ئێوارانی هەینی زۆر جیاوازی هەبوو هینی ئەمەیان باشتر بوون تا هی ئێوارەکانی تر، چونکە لەم ئێوارەیەدا یا برنج و شلەیەك بوو کە گۆشتی تێدا بوو، یان شفتە بوو، یا کفتە بوو کە قیمە و کشمیش و بادەمی تێدا بوو، بەلام چێشتەکانی رۆژانی تر جگە لە هەینی: (ساوەر، یاپراخ، نیسکێنە، سلقاو و ماشێنە... تاد) بوو لەو سەردەمەدا ئێوارانی هەینییان بەلاوە پیرۆز بوو، بایەخ و گرنگی و جیاوازییان زیاتر پێ ئەدا لە رۆژەکانی تر، ئەو ئێوارەیە وەك جەژن وابوو، دیار بوو ئەمەشیان لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە (د.خ) وەرگرتبوو، وەك خوای گەورە لە قورئانی

پیرۆزدا ئەفەرموێ (الجمعه- حج المساكين وعيد المؤمنين..) واتە ڕۆژی یا نوێـژی هـەینی حـەجی هـەژاران‌و جـەژنی ئیماندارانـه، ئەمەش شتێکی ئاشکرایەو ڕوونە کە خەڵکانەکە لەو ڕۆژگارەیەدا کـەم دەس‌و نـەدارا بـوون هـەژاران زۆر بـوون ئازووخـەی بـاش‌و گرنگ وەك لـەم ئازووخە زۆرەو چاکەی ئێستا هەیە لـەو دەمـەدا نەبوون، (برنج) ماڵە دەوڵەمەند نەبێ بە دەگمەن هەبوو هەژارەکان هەیانبوایـە ئـەویش مەگـەر پـایزان‌و گەرمـەی کـاتی چـەڵتووك ئەمـەش بۆ هـەژار گـران بـوو، بۆیـە لـە ئێـوارانی هەینیـدا نەبوایـە چێشتی برنج نەبوو، یا فەقێی مزگـەوتی وا بـوو یـا خوێندنگـە بـە دەگمـەن ئـەم جـۆرە خۆراکـە ببیـنن، جـا ئەمـە تـەنها خـۆراك‌و نـان خـواردنی ژەمـی ئێوارانیـان بـوو، بـەڵام بـۆ نیوەڕۆکانیـان فـەقێکان خۆیان بە پارە لە هاوینان‌و سەرەتای بەهاراندا کە ماست هـەرزان بوو ماستیان دەکڕی‌و نیوەڕوان نـان‌و ماسـتیان دەخـوارد، بـەڵام هاوینەکەی نان‌و ماستاویان دەخوارد، بۆ ماستاوەکە بایی فلسێ یـا دوو فلـس بـەفریان دەکـڕی‌و تێیـان دەکـرد بـەفری چـاڵە بەفرەکانی چیای گۆیژەو ئەزمڕ، لـەو سـەردەمەدا سـەهۆڵ نـەبوو، بـەڵام بـایی (١٠-١٥) فلـس ماسـتیان دەکـڕی پـڕ دوو کەوچـکی دۆخـۆر بـوو، نزیکـەی نیـو کیلـۆ دەبـوو، لـەو سـەرەمەدا کیلـۆ بەکارنـەدەهێنراو نـەبوو، بـۆ ئـەم جـۆرە خـۆراك‌و فرۆشـراوانە (کەوچك وەك عەیار) وابوو، بەڵام جاری وابوو لـە هەنـدێ شـوێندا بە کێشانە بوو، وە بەوە دەکڕدرا بەڵام ناوێ کێشەکە تورکی بـوو، بـۆ دوو کـەس ئەلیـدرەم ماسـتیان دەکـڕی کـە ١/٨ ی حۆقەیـەکی

ئەستەموولْ بوو، بۆ زیاتر لە دوو کەس ئیزرەم (ئیزدرەم)یان دەکڕی کە ئەیکردە ١/٤ی حۆقەیەك.

بەلاّم لە پایزانو زستاناندا کە ماست کەمو گران دەبوو نیوەڕوان نانو خورمایان دەخوار، یان هەندێك ڕۆژ خۆیان لە ئازووخەی دەقنەیان چێشتیان لێدەنا وەك ساوەر یا نیسکێنە.. یا برنج.. تاد یا نانو چای رووتیان دەخوارد، بۆ ژەمی بەیانیانیش لەم دوو وەرزەدا هەر نانو چای وشکیان ئەخوارد تەنها دوو مانگی بەهاران نەبێت، کە ماست زۆر هەرزان دەبوو نانو چاو ماستیان دەخوارد.

٣- سەرچاوەیەکی تری ژیانی فەقێ لەو سەردەمەدا (حەفتانەو مانگانەی پارە) بوو، هەندێك ماڵ وەك مووچە حەفتانەو مانگانەیان دەدا بە فەقێی مزگەوتەکان، ئەمانەش وەك هەندێك لە بازرگانو کاسبکارو دوکانداری دەوڵەمەندی سەر بە مزگەوتەکان، کە بۆیانیان بڕیبووەوە حەفتەی (٢٠-٣٠) فلسیان ئەدانێ یان بە مانگانە (٥٠-٧٠) فلسیان ئەدانێ، ئەمانەش چەند ماڵێکی کەمی ژمێردراو بوون کە لە (٣-٤) ماڵ تێنەدەپەڕین، ئیتر ئا بەم پارانەی نانە لەخۆ زیادەکەیانو حەفتانەو مانگانەکەیان شەکرو چاو ماستو خورماو پێخۆری نیوەڕۆیان دەکڕی، هەروەها قۆریەو پیاڵەو سابوونو شتومەکی پێویستی تریشیان دەکڕی، بەلاّم بەمانە ئەگەرچی ژیانیان بە شێوەیەکی بژیو مەمریش بوو بەلاّم هەر ئەنجام نەدەدراو نەدەژیان، لەبەر ئەوە سەرچاوەیەکی تریشیان کردبوو بە نەریتو

عادەتو یاسایەکی تایبەتمەند بۆ ژیانی فەقێ کە ئەمەش پێیان دەوت: (دەقنە).

٤- (دەقنـە) ئەمـەش سەرچـاوەیەکی تـری ژیـانی فـەقێ بـوو لەو رۆژگارەدا، جا با بزانین واتای دەقنـە چییەو چۆنە؟! هەموو سـاڵێك وەك (دابو نـەریتێکی فەقیـەتی) لـە کۆتایـە مـانگی (١٠) داو لە ناوەڕاستی وەرزی پایزانو کـاتی سـەرپەڵەو کۆکردنـەوەی ئازووخـــەی زســـتاناندا فـــەقێکان لـــەناو خۆیانـــدا فـــەقێی هـــەر مزگـــەوتێك یـــا فـــەقێی خوێندنگـــەی دێهاتـــە گـــەورەکان کاتـــێ بیانویســتایە دەقنــەی گەڕەکەکــەی خۆیانیــان بکردایــە بڕیاریــان ئەدا بە هاوکاری لەگەڵ فەقێی یـەك دوو مزگـەوتو خوێندنگـەی تـردا دەقنەکـەیان بکـەن، بـۆ ئەمەش لـە پێشـەوە فەقێی ئـەو یـەك دوو مزگەوتـــەیان ئاگـــادار ئـــەکردو پێیـــان رائەگەیانـــدن، کـــە هاوکارییـان بکـەنو یارمـەتییان بـدەن لـە فـلان ئێـوارەدا لـەدوای نوێژی مەغریب بێن بۆ ئەو مزگـەوتو خوێندنگەیـە کـە فەقێکانی دەیانویســـت دەقنـــە بکـــەن، بـــۆ ئـــەوەی بـــە مـــالانی گـــەڕەکی مزگەوتەکەی خۆیاندا بگەڕێنو ئازووخەی زستانیان کۆبکەنـەوە، ئـەمجا ئـەوانیش لـەکاتی دیـاریکراودا دەهـاتنو کۆدەبوونـەوەو یارمـــەتییان دەدان، ئـــەنجا هەنـــدێك لـــە ســـوختەکان هەریەکـــەو توورەکەیـەکی بـۆ ئازووخـەی وەك (بـرنج، سـاوەر، نیسـكو نـۆك، ترخێنە.. تاد) هەڵدەگرت، هەروەها سەتڵێك یا دەفرێکـی قووڵیـان هەڵـدەگرت بـۆ رۆن تێکـردن، ئـەمجا دوای نوێـژی مـەغریبو نـان خواردن فـەقێکانی مزگەوتەکە لەگەڵ فەقێی مزگەوتـەکانی تـردا،

که هاتبوون بۆ هاوکاری کردنیان و هەم کارێکی وەك دەسیاویش وا بوو، ئیتر بە فەقێی موستەعی و سوختەوە هەر هەموویان هەڵدەستان و دەڕۆیشتن ماڵ بە ماڵی گەڕەکی مزگەوتەکەی خۆیاندا دەگەڕان، کاتێ دەچوونە بەردەم دەرگای هەر ماڵێك هەندێك لە فەقێکان بە دەنگی بەرز دەیانوت: (دەقنااای فەقێ) بە درێژکردنەوەی دەنگی ئەلفی دەقنا ئەمجا باقیەکەی تریشیان بە هەمان دەنگی بەرزتر لە ئەوان و بۆیان دەسەندنەوە و دەیانوت (بچنە بەهاااشتی.) بە درێژ کردنەوەی دەنگی ئەلفی بەهاشتی. ئیتر خەڵکان و کەیبانووی خاوەن ماڵەکە بە پێی بوون و توانای خۆیان (برنج، ساوەر، نۆك، نیسك یا ترخێنەی سەلك یا رۆن یا پارە...) جا یەکێك یا دوو یا زیاتر لەم جۆرە ئازووخانەیان ئەدا پێیان، ئەو فەقێیەی توورەکەی برنجی پێبوایە بانگیان ئەکرد بە برنج، ئەوەی هی ساوەری پێبوایە بە ساوەر بانگ دەکرا بەو شێوەیە نیسك بە نیسك و ترخێنە بە ترخێنە... تاد، ئیتر بەو جۆرە هەر فەقێیە و بەناوی ئەو ئازووخەیەوە بانگ دەکرا کە توورەکەکەی هەڵگرتبوو، ئیتر بانگکردنی هەڵگری توورەکەی ئازووخەکە بەناوی ئازووخەکەیەوە نوکتە و پێکەنینێکی تێدا بوو، بەو جۆرە ناوی فەقێکە ببوو بەناوی ئازووخەکە، بەڵام پارە وەرگرتنی دەقنە لەلایەن یەکێك لە موستەعییەکانەوە وەردەگیرا، مزگەوتی وا هەبوو ماوەی دەقنەکەی لە (٣) شەوی زیاتر دەخایاند، جاری وا هەبوو ئەم دەقنەیە هەندێ کێشەی لێ پەیدا دەبوو، ئەمەش لەو مزگەوتانەی کە سنوور تێکەڵاو و پێکەوە

بوون لە هەندێ ماڵەکانیاندا کە لە سنووری (٢-٣)ی مزگەوتدا بوون، ماڵی وای ئەم سەر سنوورە تێکەڵانە هەبوو ئازووخەی دەقنەکەیان بە فەقێی هەردوو مزگەوتەکە دەدا.

ماڵی وایش هەبوو بە هەردوو لایان نەدەداو دەیانوت: ئێمە سەر بە فلان مزگەوتین دەقنەکەمان دەدەین یا داومانە بە فەقێکانی ئەو مزگەوتە، جا مەسەلەی ئەم ماڵانە هەندێجار دەبوونە هۆی گلەیی و گازەندەی فەقێکانی هەردوو مزگەوتەکە یا مزگەوتەکان، چونکە هەر یەکەو دەیانوت: ئێوە لە دەقنەکەدا هاتوونەتە ئەو ماڵانەی کە سەر بە مزگەوتی ئێمەیە.

(بەڵگەو نیشانەی زانین و ناسینی سنووری ماڵەکانی نێوان مزگەوتەکان (هامشۆو هاتوچۆی نوێژ کەرانی ماڵەکان بوو کە لە چی مزگەوتێك نوێژو جەماعەتیان بکردایە ئەوە ئەو ماڵانە سەر بەو مزگەوتە بوون) جا فەقێی هەندێك مزگەوت لەم بارەیەوە وریاییان هەبوو، بۆ دەقنەکەیان هەوڵیان دەدا دەس پێشخەرییان بکردایەو دەهاتن دەقنەکەیان پێش دەخست هەتاوەکو ئەو ماڵانەی تێکەڵاوی سنووری مزگەوتەکانیان لە دەس نەچێ!.

بەڵێ لە دوای ئەوەی کە لەو شەوەدا دەقنەکەیان تەواو کرد، یا چەند ماڵێکیان تەواو کرد هەموو دەهاتنەوە حوجرەی ئەو فەقێیانە کە دەقنەکەیان بۆ کراوە، ئەمجا هەر ئازووخەیەك دەفری تایبەتی خۆی هەبوو لە ژووری ئازووخەکەیاندا وەك: کووپە، گۆزە، دیزە.. هتد کە ئەم جۆرە ڕێگەی ئەوەی نەبوو مشك بچێتە ناویانەوە، ئازووخەکانیان دەکردە ئەم دەفرانەوە.

ئیتر دوای ئەوە هەموو فەقێکان بە میوان و خاوەن حوجرەوە لە حوجرەکەدا دادەنیشتن، چا لێدەنرا، دوای چا خواردنەوە دەس دەکرا بە خواردنی خورما و گوێزو مێوژ کە فەقێکانی مزگەوتی دەقنە بۆ کراوەکە لەوەوپێش کڕیبوویان و ئامادەیان کردبوو بۆ فەقێ میوان و یارمەتی دەرەکانیان، ئەم جۆرە شت کڕین و جۆرە خواردنانە هەم نەریت و ڕێز گرتنێکیش بوو بۆ میوانە هاوکارەکانیان،چونکە لەو سەردەمەدا وەك ئەم ڕۆژگارەی ئێستاکە ئەم جۆرە میوەهاتەی وەك (سێوو پرتەقاڵ و مۆز..) زۆر نەبوون کە بۆ میوان ئامادە بکرێن و دابنرێن، ئەمجا لەدوای ئەوە دەستیان دەکرد بە هەندێ یاری تایبەتمەندی خۆیان و قسەو وتەی نوکتەی خۆش و پێکەنین، ناو بە ناویش پرسیار لە یەك کردنی بابەتەکانی خوێندنی خۆیان، بەو جۆرە تا شەوگارێکی درەنگ ئاوها هەموویان رایان دەبوارد.

بەم شێوەیە لە وەرزی زستاندا فەقێکان خۆیان لەم ئازووخەیە چێشتیان لێدەنا، بۆ ژەمی نیوەڕۆیان، جاروبارو ناو بە ناویش نیوەڕوان کە چێشتی برنجیان لێ بنایەو باش بوایە مامۆستای مەلاباش و وانە بێژی مزگەوتەکەی خۆیانیان دەعوەت دەکرد، چونکە چێشتی برنج لەو ڕۆژەدا چاکترین خواردەمەنی بوو، لەبەر ئەوەی برنج زۆر کەم بوو، هەژار مەگەر ساڵەو ساڵ لە کاتی وەرزی پایزدا بیزانایە تامی چییەو چۆنە؟!

پارەی دەقنەکەیان ئەگەر دەسکەوتێکی وایان هەبوایە ئەوەندە هەبوایە هەریەکەو سەرو لۆ بەرگیان بۆ خۆیان پێ

دەکرێ، بەڵام لەمەدا بەشی فەقێ سوختەکان زۆر کەمتر بوو لە هینی موستەعییەکان، چەنکە هەموو پارەی دەقنەکە لەژێر چنگی ئەماندا بوو، ئەمان خۆیان بە داگرو کاربەدەستو سەرپەرشتیاری کاروباری حوجرەکە دەزانیو سوختەکان هەمیشە ملکەچو چاو لەژێر دەستی ئەوان بوون، نەیان دەتوانی لە فەرمانیان بچنە دەرەوە، خۆ ئەگەر کەمترین بێ گوێ رایەڵییان بەرامبەریان بکردایە ئەوە ئیزنیان دەدانو لە حوجرە دەریان دەکردن، ئیتر بە زەحمەتیش بۆیان دەگونجا تا لای مامۆستاو موستەعییەکی تر جێگەی دەست بکەوتایە!.

ئەو خالانەی پێشەوە کە وێژراوو ژمێردراو روون کرانەوە سەرچاوەو هۆی ژیانی فەقێ بوون، بەڵام بەمانە نەك ژیانیان هەر دابین نەدەبوو، بەڵکو ژیانیان زۆر کەمو کورِیو کولە مەرگیش بوو، چونکە خۆراکی باشیان نەبوو، بەرگو پۆشاکی باشین نەبوو، خوێندنی بە شێوەیەکی رێکخراوو رێكوپێکیان نەبوو، بیرو هۆشیان سەربەستو ئازاد نەبوو، هەمیشە چاویان لە دەستی یارمەتی خەڵکان بوو، چاوەڕوانی ئەوە بوون کە رۆژێك کەسێ، یاخود خێرۆمەندێکی دەوڵەمەند خێرێك بکەنو بەشی ئەمانیشی تێدابێ!

٥- بەڵام بۆ دەسکەوتنی کڕینی کتێبو دەفتەرو بۆ جلو بەرگو هەندێ پێویستی تری خۆیان رێگەو چارەسەرێکی تریان بۆ دۆزی بوونەوە ئەویش ئەوە بوو (رەمەزانان) واتە لە مانگی رەمەزاندا ئەگەر بۆ (پێش نوێژی) تەنها رۆژی جەژن گوندێکیان

دەس بکەوتایە دەبوون بە مەلاو ئیمامی مانگی رەمەزانی ئەو گوندە، ئەویش کە ئەو گوندە مەلای دائیمییان نەبوایە، جا یان حەفتەیەك پێش جەژن یان هەر لە سەرەتای مانگەکەوە دەچوونە گوندەکەو بەرنوێژی جەماعەتیان بۆ دەکردن، ئەمجا عەسران لەدوای نوێژ ئایەتو فەرموودەکانی پێغەمبەریان بۆ خەڵکەکەی دەخوێندنەوە، بەو جۆرە دەمانەوە تا رۆژی جەژنو خەڵکەکەیشی سەریان لەلایان دەقەبلاَنو سەرفیترەکانیان دەدا پێیان، جارو رێکەوتی واش بوو ئەو مەلای رەمەزانە ئەگەر کاتەکەی کاتی خەلەو خەرمانان بووایە ئەوە دەسکەوتی زیاتر دەبوو، چونکە ئەو کاتە زەکاتی هەندێ دانەوێڵەی وەك گەنمو جۆیشیان ئەدا پێی، ئەو فەقێیانە کە ئەو ماوەیە لە (دێ)یەکەدا بوون خواردنو خەوتنیان یا لەماڵی کوێخادا یا لە ماڵی دەوڵەمەندو ریش سپییەکاندا بوو، جاری واش بوو لەلایەن هەندێ ماڵی ترەوە بۆ نانخواردنی ئێواران دەعوەت دەکران، ئەمجا چی دەغڵو دانێکی سەرفیترەیان کە لە گوندەکەدا دەست بکەوتایە دەیان فرۆشت، ئەمجا بە پارەی ئەوە جلوبەرگو کتێبو پێویستییەکانیان پێ دەکڕی، هەروەها ئەو فەقێیانە بۆ جەژنی قوربانیش دیسان دەچوونەوە بۆ گوندەکەیان بۆ ئەوەی نوێژی ئەم جەژنەیشیان بۆ بکەن. ئیتر هەموو ساڵێ ئەم فەقێیانە بۆ جەژنەکان دەچوونەوە بۆ گوندەکە، بەلاَم ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ساڵەو ساڵ تەنها ئەم رێکەوتنەو توانای ئەم کەلوپەل کڕینانەیان هەبووە، ئەمەش وەنەبێ بەشێوەیەکی

گشتی هەموویان ئەم مەلایەتییەی رەمەزانیان دەس بکەوتایە، بەڵکو تەنها هەندێ لە فەقێ موستەعییەکان ئەمەیان چنگ دەکەوت، بەڵام سوختەکانیان هەر زۆر بەکەمی و بە دەگمەن ئەم مەلایەتییەیان دەست بکەوتایە، لەبەر ئەوە ئەمانەیان هەرچۆنێ هەبووە توانیویانە بەرگی ساڵانە بۆ خۆیان دابین بکەن، بێگومان دیارە ژیانی ئاوا ژیانێکی نائاساییەو ژیانێکی پڕ لە ئاڵۆزو سەختو ناهەموار بوو، ژیانێکی بژێو مەمرە بوو، ژیانێکی بێ ئیستیقرارو نادیارو ناڕێكو نامۆ گەر بوو، ژیانێك بوو لەژێر رکێفو کۆنترۆڵی قەدەردار بوو، ژیانی دەسپانکردنەوە لە خەڵکی، ژیانێ بوو عیززەتی نەفسی تێدا نەبوو، لە راستیدا وەك دەروەزەو سواڵ وابوو، هەمیشە رووپەرمایی و چاولەبەری دەستی کەسانێ بوون کە هەرگیز بە ئانو زەمان نەیان دەتوانی لە روویاندا حەق وێژو حەق دووبن.

ژیانێ بوو سەربەستی و ئازادی دەروونو بیروڕایان بێ بەشو لاوازو پاوەن کراو بوو، بەتایبەتی لە کاروباری ئاسایی کۆمەڵایەتیداو بەڵکو ئاینیشدا بە جۆرێکی وەها کەوتبوونە ناو بازنەیەکی شێواوی داخراوی نازانستییەکی وەهاوە کە نەیان دەتوانی دەلاقەو کەلێنێکی لێ بکەنەوەو لێیەوە بچنە دەرەوە، چونکە لەبەر ئەوە فەقێ بە هیچ جۆرێو لە هیچ کاتێکدا نەیدەتوانی و نەیدەوێرا بە ئاشکرا هەتا با بڵێین بە نهێنیش بە خەیاڵو بیری هەندێکیاندا نەدەهات کە بڵێ ئەم ژیانەی ئەوی تێدایە نا دروستو ناهەموارەو پێویستی بە گۆڕانو

ڕێکخستنێکی بەرەو باش بوونە!، بەڵکو بەلایەوە ئەو جۆرە ژیانەی ئەوی تێدایە وەك کارو یاسایەکی سروشتی خوایی بێ کە چەسپاوو نەگۆڕ بێ و ئاسایی بێ ئاوها بوو، ئەو فەقێیانەش کە زاناو ئاگاداری ژیانە ناخۆشەکەیان بوون، نەدەوێران و زاتیان نەبوو کە ڕەخنەو هەڵە ئاراستەی ئەو ڕێبازە ژیانەیان بکەن، هەروەها نەیاندەتوانی ناڕەزایی خۆیان لە هەندێ ماڵ یا کەسێ یا دەوڵەمەنێ لەوانەی کە گۆشەیەکی بچووکی سەرچاوەی گوزەران و ژیانە بژێو مەمرەکەیان بوون بیانخەنە رووکاری ئاشکرا کردن و درکاندن، کە بڵێن فلانە ماڵ، یا فیسارە کەس، یا فلانە دەوڵەمەن: خێرەکەیان، یا خواردنەکەیان، یا ئەو چێشتانە نادەن بە فەقێ کە لە خواردنی تایبەتمەندی خۆیان بێ، لەبەر ئەوەی ئەگەر باسیان بە خراپ بکردایە ئەترسان بە سپڵەو بە بەد نمەك لە قەڵەمیان بدەن، چونکە هەندێ ماڵ و کەسانێك هەبوون کە خۆراك و چێشتی تایبەتمەندی خۆیان جیاواز بوو لەگەڵ ئەوەی ئەیاندا بە فەقێ و هەژاران و دەروێشان و سواڵکەران، بە تایبەتی ئەو فەقێیانەی کە لە خوێندنگەی تەکیەو خانەقاکاندا دەیانخوێند، خۆراکیان روون و دیار بوو، شۆربا بوو (وەك: نیسکێنە یا شۆربای برنج یا ساوەر.. هتد) ئەمانە بوون، خۆ نانە ڕەقەی فەقێش زۆر مەشهوورە..، بەڵام ماڵی شێخ و ئاغاو بەگ و خان: پشتگیرانی سەردەمی پاشایی، دیوەخانەکانیان هەمیشە کام خۆراك و خواردنی نایاب بوو، کام گۆشتی ناسکی بەرخ و کاوڕ بوو، کام گۆشتی مریشك و قەل و قازو باڵندەی چاك بوو،

کام برنج و جۆرەکانیان نایاب و ناودار بوو، کام میوەی بەتام و گرانبەها بوو!! لەوێ پڕ بوو! ژیانی فەقێش نانە رەقەو شۆربا بوو، کێ و کام فەقێ بەزات و بەزاخ و کون لە جەرگا نەبوو بوو دەیوێرا ئەم جۆرە ژیانانە بەراورد بکا و بیدرکێنێ و بیخاتە دیوی دەرەوەی بیرو هۆش و رای خۆیەوە؟! ئەمە لەبارەی بارو دۆخی ژیانی خۆراک و خواردنی فەقێوە بوو، بەڵام لێرەدا ئەوەی کە جێگەی سەرنج راکێشە بەڵکو با بڵێم سەرسوڕمانیشە ئەوەیەو ئەم پرسیارەشی لێ بەرز ئەبێتەوەو ئەڵێ: بۆچی سەرچاوەی ژیانی زانایان و رابەران و هەڵگرانی ئەم نامە گەورەو پیرۆزەی رێبازی ئاینی ئیسلامە ئاوها لەم ئاستە بێ بایەخ و نزمەو لەم شێوە ناشیرینەو ناڕێک و پێکەدابێ؟! بۆچی لەسەر بنچینەیەکی زانیاری و بە گرنگ و بایەخداردا دانەمەزراوە؟! ئەبوو لەبەر ئەوەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە پلەیەکی هەرە بەرزو رێبازێکی گرنگدایە کە سەرچاوەکەی زاتی پەروەردگارە ئەبوو سەرچاوەی ژیانی زانایانی ئەم رێبازە پیرۆزە بێ وێنەیە بەرزترین سەرچاوەی رێزو نرخ و بایەخ پێدان بوایە!! سەرچاوەیە بوایە لەسەر بنەڕەتی زانیاری و گرنگایەتی دابڕێژرایەو دابمەزرایە، دیارە کە ئەمەش دەبووە هۆی بەهێز بوون و بالاگەری و بەردەوامی ئاینەکەش، چونکە شتێکی زۆر زانراوو روون و ئاشکرایەو هیچ گومانی تێدا نییە ئەگەر سەرچاوەی ژیانی زانایانی ئەم رێبازو یاساییەی کە خوای پەروەردگار فەرمانی داوە بۆ ژیانی مرۆڤ و پەیرەو کردنی لەسەر زەوی و هەموو جیهان

ئەگەر لە پلەیەکی نزمی و بێ سەرو بەرو بێ بنچینەو بێ هێزو بێ بایەخدا بوو دەبێتە هۆی شکستەی ئاینەکە، دەبێتە هۆی بێ هێزیو لاوازیو پەرتەوازەیی ئایینەکە، دەبێتە هۆی پەیدابوونی هەزارەها گێروگرفتو کێشەی پڕ لە ئاڵۆزوزیان بەخش، پڕ لە کاروبارو بارودۆخی نالەبارو پەیدا بوونی جۆرەها پەلو پۆی زۆرو رێبازی ناڕاستو نادروست، وەك دەبینین ئەم کەمتەرخەمییەی بنچینەی ئایینەکە بووە تۆی ئەوەی کە هەندێ کەسانی نەزانو نەشارەزا بە واتای (زانایيو اجتهاد)ی خۆیەوەو لە پێناوی بەرژەوەندی کەسایەتی خۆیەوەو ژیانی تایبەتمەندی خۆیەوە رێبازێکی دەسکردو هەڵبەسراوی بۆ خۆی رێکخستووە، بەڵام لە پەنای ئاینێکی رووکەشو روو پۆشدا، چونکە زۆر باش مرۆڤی زانا هەستیان پێ دەکەن کە ئەوانە مەبەستە سەرەکیو نهێنییەکەیان تەنها ژیانەکەیانەو بەس، بە هەر حاڵ: دووان لەم بوارەدا درێژە زۆر ئەکێشێ، لێرەدا بەم تۆزە نووسینەیە روون نابێتەوەو چارەسەر ناکرێت پەیبردن بە ناخو ریشەی ئەم بارو دۆخەو شی کردنەوەو لێکۆڵینەوەیو گەیشتن بە پۆپەی مەبەست با ئەمە رووبەڕووی زانایانو پسپۆڕانی ئەم بوارە بکرێتەوە، بەڵکو ئەوەی پێشوو تەنها پرسیارێکی هەست پێکردنی بیرو خەیاڵ بوو.

ئەمجا با کەمێکیش باسی دەربارەی چۆنیەتی خوێندنو سەرچاوەو رێبازی فێربوونی زانینو خوێندنی فەقێ بکەین، وەك لە پێشەوە باسمان کرد کە فەقێ ئەو بابەتو زانیاریانەیان

دەخوێند کە پەیوەندییان بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە هەبوو، وە ڕێبازو یاسای قورئانی پیرۆزو سوننەتەکانی پێغەمبەری ڕوون دەکردەوەو تا لە دڵو بیرو هۆشی خەڵکانی موسڵماندا جێگیر بێ و بچەسپێ، سەرچاوەی فێربوونو زانینی فەقێی سوختە موستەعی بوو، فێربوونو زانینی موستەعیش مامۆستای وانەبێژی گەورەو ئیمامی مزگەوت بوو، جا ئەگەر فەقێ چی سوختە یاخود موستەعی مامۆستا وانە بێژەکەی کە لەو بابەتانەی وانەکەدا کە پێی دەوتن کەم توانا بوایە واتا نا بەڵەدو نەشارەزا بوایەو نەزان بوایە! بۆچی چی قورەت بوو ئەو فەقێیە بیتوانایەو بیوێرایەو بیوێژایە کە مامۆستاکەی وانەو بابەتی دەرسەکەی باش نازانێ و ئەم هیچ جۆرە سوودێکی لێ وەرناگرێت؟!! بەڵکو چی جای ئەوەش ئەگەر مامۆستاکەی با هەموو وانەکانی بە هەڵەش پێ بوتایە واتە نەیزانیایە دەبوو ئەو فەقێیە بە شێوەیەکی ناچاریو بێ دەسەڵاتی بێ ئەوەی لە وانەکەی تێبگەیشتایە پێویست بوو لەسەری بیوتایە (بەڵێ قوربان وایە!) ئەمە ناڵێم بە شێوەیەکی گشتی وابوو، بەڵام ئەم دیاردەیە لە هەندێ خوێندنگەو لای وانەبێژدا هەبوو، لەو سەردەمەدا چاپەمەنی وەك ئەم ڕۆژگارەی ئێستاکە کە زۆر نەبوو، زوربەی ئەو کتێبانەی کە دەیانخوێند دەسنووس بوون، ئەمجا خوێندنێکی ڕێکخراوو بنکەییان نەبوو، جگە لەوەش ئەگەر فەقێیەك ئا ئەو جۆرە ڕەخنەیەی یا نارەزاییەی مامۆستاکەی بخستایەتە رووکاری دەرخستنو ئاشکرا کردن ئەوە دەبووە هۆی

ئەوەی کە لەو خوێندنگەو مزگەوتەدا جێگەی پێ لێژ بکرێت، لە ئەنجامیشدا دەر دەکرا! خۆ ئەگەر بیشزانرایە لەبەرچی و لەسەرچی دەرکراوە ئەوە هەرگیز لە هیچ مزگەوت و خوێندنگەیەکی ئەو شارەدا جێگەو ژیانی نەدەبووەوە، ناچار دەیوت: (ارض الله واسعة!) ئەمجا ئەو فەقێیە کتێب و پێخەوەکانی دەپێچایەوەو دەیدان بە کۆڵی داو بەرەو (گەراج) ملی دەنا ئەگەر بۆ شارو جێگاو خوێندنگەیەکی زۆر دوور بچوایەو ئوتومبیلی لۆریش هەبوایە! چونکە لەو سەردەمەدا ئوتومبیل زۆر کەم بوو لە سلێمانیدا تەنها یەك گەراج هەبوو ئوتومبیلەکانی لە (٢٠-٢٥) تێنەدەپەڕین ، وە زوربەی خەڵکانی نەفەراتیش هەر بە لۆری دەڕۆیشتن بۆ شارەکانی تر، یا پاسی کوشن و کورسی تەختەو داری سەرگیراو هەبوون کە بە (هەندل) دەخرانە ئیش ئەمانەش زۆر کەم بوون، بۆ کەرکوك تەنها یەك دانە هەبوو کە لە نێوان سلێمانی و کەرکوکدا هاتوچۆی دەکرد، ئەگەر لە کاتژمێر (٨)ی سەر لە بەیانیەوە رێ بکەوتایە ئەوە بۆ کاتژمێر (٢)ی دوای نیوەڕۆ دەگەیشتە کەرکوك، چونکە رێگاو شەقامەکەی وەك رێگای ئەم سەردەمەی ئێستاکە تەخت و چاك قیرتاو نەبوو،بەڵکو جادەکەی زۆر باریك و تەسك و تروسك بوو، بەرەو ژوورەی رەپ و زەقی زۆر تێدا بوو هەروەها بەرەو خوارەشی، سەرەڕای کەل و کۆسپی رێگاکەشی کە دەبوونە هۆی تاسەی زۆرو زەبەنی ناخۆش، جاری وا بوو نەفەرەکان سەریان دەیدا بە سەقفی ئوتومبیلەکەداو ئەمجا بەسەر یەکتریدا

دەکـەوتن و زوربـەیان تووشـی ئـازار دەبـوون، هـەروەها جگـە لـە ئوتومبیل بە کاروانی (قافلە)ی هێسترو بارگیرو گوێ درێژیش لـە نێـوان شـارەکاندا هـەبوو، بـەهۆی بازرگـانی نێـوان سـنوورەکانی دەوڵەتانـەوە، بـەڵام ئەمـەیان بـەرە بەرە ئـەبینرا رووی لـەکـەمی و نـەمان بـوو، جـا ئـەم فەقێیـەی کـە جێگـەی لێ تێـك چـووە ئەگـەر کرێی ئوتومبیل یـا کـاروانی هەبوایـە ئـەوا پێـی دەڕۆیشـت، خـۆ ئەگەر نەیبوایە ئەوا شتەکانی شەتەك دەدا بە کۆڵیداو دەچوو بۆ خوێندنگەی گونـدێکی نزیك شـار کـە (٢-٣) کاتـژمێر یـان زیـاتر دوور بوایەو رێگەی چوونی ئوتـومبیلی نەبوایە، یـان هەیبوایـەو ئـەم پـارەی کـرێی پـێ نەبوایـە، لەبـەر ئـەوە شـوێن و جێگـای خوێنـدنی فـەقێ سـابت و نـەگۆڕ نـەبوو لـە یـەك شـوێن و شـارو خوێندنگەدا بەڵکو شارەو شارو دێ بەدێ لە هـەموو کوردسـتانی عێـراق و ئێرانـدا بـە خوێندنگاکانیـدا دەگـەڕان، جـا وا دەبـوو یەکسـەر لـەو خوێندنگەیـەی کـە بـۆی دەچـوو جێگـەی وەچـنگ نەدەکەوت، ناچار دەبوو بەهۆی هەواڵ وەرگرتنـی کـام خوێندنگـە جێگە هەیە ئەڕۆیشت بۆ ئەوێ، چونکە بەهۆی هاتوچۆو گـەڕانی سەرەمڕی فـەقێکان بـەناو خوێندنگاکانـدا دەزانـرا کـام خوێندنگـە جێگای فەقێی هەیە یان نییە؟! گـەلێ جاری وابوو، بـەڵکو هـەر بـە سەرەمڕی وابوو کە زۆر لە فەقێکانی خوێندنگەکانی کوردسـتانی عێـراق دەچـوون بـۆ خوێندنگـەو مزگـەوتی دێهـات و شـارەکانی ئێـران لـە ناوچـەی کوردسـتان، دەچـوونە: سـنە، سـەقز، سـابڵاخ، مـەهاباد، بۆکـان، سەردەشـت، پـاوە، بانـە، مـەریوان.. هتـد،

هەروەهاش گەلێ لە فەقێی دێهات و شارەکانی کوردستانی ئێرانیش دەهاتنە دێهات و شارەکانی کوردستانی عێراق دەهاتنە خوێندنگەکانی وەك: تەوێڵە، بیارە، عەبابەیلی، پریس، هەڵەبجە، سلێمانی، قەلادزە، رانیە، هەولێر، دیبەگەو گەلێ شوێنی تریش وەك کەرکوك، کفری، قزڕەبات، خانەقین.. هتد، هەندێ جاری وا بوو فەقێی موستەعی کە لە خوێندنی پەرتوکێك دەبووەوە، وە دەیویست دەست بکات بە خوێندنی پەرتوکێکی تر ئەمە دەبووە کێشەیەکی دڵ ئازار بۆی، چونکە ئەم کتێبەی بە ئاسانی دەست نەدەکەوت، یان هەبوو بەلام نرخەکەی گران بوو ئەمیش پارەی کڕینەکەی نەبوو، ئەمجا ناچار دەبوو یان ئەبێ خۆی بە خەتی خۆی بینووسێتەوە بە مرەکەب و ئووچی نووك فاقدارو قلێشاو وانە بە وانە سا تا کەی تەواوی دەکات و لێی ئەبێتەوە، یان ئەگەر بە ئەمانەت دەستی بکەوتایە لەلایەن هاوڕێیەکیەوە یا ناسیاوێکی لێی دەخواست کە لە خوێندنی بووەو تەواوی کرد ئەبێ یەکسەر بیداتەوە، بارێکیتر لە نارێکی خوێندنی فەقێ: جاری وا بوو فەقێیەك مانگێ چل رۆژ یا زیاتر جێگەی خوێندنی دەست نەدەکەوت و بە زوربەی خوێندنگە ئاینییەکانی کوردستانی عێراق و ئێراندا کوڵ بە کوڵ بە کتێب و پێخەوتنەکانیەوە ئەسووڕانەوە ئەمەش دیارە زەرەرو زیانێکی زۆر گرنگی پێ دەگەیاندن، لە خوێندن دوای دەخستن، یا جاری وا بوو فەقێیەکی زیرەك و خاوەن بەهرە بەهۆی بێ جێگاییەوە ناچار دەبوو مل کەچ بکا لەلای مامۆستایەکی یا مەلایەکی کەم

توانا و کەم زانا دەیخوێند کە ئەمەش زیانێکی گرنگی لە ڕەنج و ژیانی خوێندنەکەی دەداو، هەم لە ڕاستیشدا زیان بوو بۆ ڕێبازی ئاینی و کۆمەڵگەی موسڵمانان بە شێوەیەکی گشتی، یا بە پێچەوانەوە، هەبوو فەقێیەکە نازیرەك و کەودەن بوو: سا یان بە نارەواو پۆخڵاواتییەوە گەیشتبووە پلەی موستەعی و بەهۆی خزمایەتی و دۆستایەتی و ناسیاوییەوە لای مەلا چاکی دەس کەوتبوو دەرسی لەلا دەخوێند و جێگەی فەقێ زیرەکەکانی گرتبوو، یان بەهۆی دەوڵەمەندی باوکی فەقێکەوە بوو، یان کوڕی کەسێکی ناودار بوو، یا کوڕی مەلایەکی تر بوو، بەم هۆیانەوە ئەو فەقێ کەودەنە لەلایەن مەلا چاکەوە جێگەی پێ ئەداو لەلای دەیخوێند، ئەمەش بارێکی تری نادادوەری خوێندنی فەقێ بوو، یەکێك لە کێشەکانی نارێکی خوێندنیان بوو، بەڵکو ئەمە دەبووە هۆی خوێندنێکی ناپوخت و پۆخڵاوات و کەم توانا و کەم زانا و ئابلۆوقە نەدان و ئاگادار نەبوونیان بە چاکی بەسەر زانیارییە پێویستە شەرعییەکان دا.

جا بە کورتی ئەمە هەندێ بوو لە کێشەی حاڵ و گوزەرانی فەقێکانی سەردەمی پاشایی و لەوە پێشیش چی لە ڕووی باردۆخی ژیانیان و چی لە ڕووی چۆنیەتی باری خوێندن و فێربوونی زانیارییەکانیانەوە.

# دەنگی فەقێ

وەك لە پێشەوە روونمان کردەوە، لەو ساڵانەی (١٩٥٠-١٩٥٣) لە سەردەمی رژێمی پاشاییدا لەناو فەقێکانی خوێندنگەکانی شاری سلێمانیدا کۆمەڵێ فەقێی وریاو زیرەكو روونـاکبیرو شارەزا لە ژیانی کۆمەڵایەتی هەبوون کە هەستیان بەم ژیانە پڕ لە چێژی تاڵیو ئازارو نادروستو ناهەموارەی خۆیان دەکرد، لە ئەنجامیدا ئەمانیش بە شێوەو رێبازێکی نهێنیانە هەڵسانو کەوتنە کۆششو تەقەلا بۆ دۆزینەوەی رێگەو چارەسەرێکی ئەم ژیانو گوزەرانە سەختەیان، ئەمجا دوای وتووێژو بیر لێ کردنەوەو هەڵسەنگاندنی کێشەکە بۆ ئەوەی ئەم حاڵەتاڵەی ژیانیان بخەنە بەر دیدی کاربەدەستانو هەم زانایانی ئاینیو روناکبیرانیش بڕیاریانداو هاتن بە نووسینو وتار بڵاوکردنەوە دەستیان کرد بە لێدوانو لێکۆڵینەوەی بارودۆخو حاڵی ژیانی خۆیانو روونکردنەوەی تەنگو چەڵەمە پڕ لە ئەشکەنجەو ئاڵۆزەکانی، وە بە نهێنی ئەم وتارانەیان بە خوێندنگەو مزگەوتەکاندا بڵاو دەکردەوە، ئیتر لە ئەنجامیشدا هەر چۆنێ بوو توانیان هەر بە نهێنی گۆڤارێکیش دەربکەن بە ناونیشانی (دەنگی فەقێ) ئەم گۆڤارە فەقێکان خۆیان بە قەڵەمی قۆپیو کاغەزی کاربۆن بە دەستو خەتی خۆیان دەیان نووسییەوە، لاپەڕەکانی نزیکەی (١٢- ١٥) لاپەڕە دەبوون، ئەو کۆمەڵە فەقێو موستەعییانەی کە ئەركو قورسایی سەرپەرشتیو دەرکردنی گۆڤارەکەیان لە ئەستۆ گرتبوو یەك لەوانە بەڕێز مامۆستا شێخ

کەمالی مامۆستا شێخ نوری تەکیەیی و مامۆستا محەمەدی مەلا عەبدولکەریمی (مدرس) بوو، منیش کەم تا فرەیەك هاوبەشی و هاوکاریم لەگەڵ دەکردن، بەشداری نووسینەوەی هەندێ لە وتارەکانی گۆڤارەکەم دەکرد، هەروەها چەند فەقێیەکی تریش کۆمەك و هاریکارییان هەبوو، یەك لەوانە وا بزانم و لەبیرم نەچووبێ مەلا عەلی ناوێ بوو خەڵکی جوانڕۆی کوردستانی ئێران بوو، لەگەڵ مەلا عەلی یەکی تریشدا کە خەڵکی گوندی (تووتاقاج)ی لای شارەزوور بوو، هەروەها لەگەڵ چەند فەقێیەکی تریشدا کە ئێستاکە ناویانم لەبیر نەماوە و نایزانم، دەنگی فەقێ وەك لە پێشەوە وتمان لەلایەن ئەم کۆمەڵە فەقێیەوە بە نهێنی دەردەچووو بڵاو دەکرایەوە، بەڵام تەنها تایبەتمەند بوو بە فەقێوە و بە دزییەوە دەخرایە ژوورو حوجرەی خوێندنگەی فەقێی مزگەوتەکانەوە، ئەم بڵاوکردنەوەیەش لەشەوەکانی (سێ شەممەو هەینی)دا ئەنجام ئەدرا، چونکە لە رۆژەکانیاندا — واتە لەو دوو رۆژەدا— وانەیان نەدەخوێند، وەك داب و نەریتێ ئەو دوو رۆژەیان دانابوو بۆ حەوانەوەو پشوودانیان، لەبەر ئەوە لەو شەوانەدا دەیان پەرژاو هەل بۆ رەخساو بوون هەوڵ و تەقەلایان دەدا کە بە نهێنی گۆڤارەکەی دەنگی فەقێ بەدزییەوە بیخەنە ناو حوجرەو خوێندنگەی مزگەوتەکانەوە، چونکە لەو رۆژە پشووانەدا فەقێکان وانەیان نەدەخوێند دەیانتوانی بە باشی گۆڤارەکە بخوێننەوە، بۆ ئەم مەبەستەی بڵاو کردنەوەو زۆر گرنگ پێدانی هەندێ فەقێی وریا و لێوەشاوەو شارەزاو ئازایان

لـە موسـتەعی و سـوختە هەڵبـژارد، مـن وەك وتم: جگـە لـەوەی بەشداری نووسینەوەی هەندێ لە وتارەکانیم ئەکرد، لە هەمان کاتیشـدا هاریکـاری و بەشـداریم لـە دابەشـکردنی بڵاوکردنەوەکەیشی دەکرد، هەتا شەوێکیان کە شەوی هەینی بوو لەکاتی جەماعەتی نوێـژی خەوتنان (عیشـا)دا بوو چوومە مزگـەوتی خانـەقای مـەولانا خالیـد، خـۆم نزیـك کـردەوە لـە حوجرەی فەقێکان بینیم حوجرەکە چۆڵەو کەسی تێدا نییە، تێگەیشتم و زانیم کە هەموویان لە نوێـژی جەماعەت بوون، ئیتر ئەم کاتەش هەلێکی چاك بوو کە بتوانم نوسخەیەك لە گۆڤارەکە هەڵبدەمە ناو حوجرەکەیانەوە، من تەنها لە فەقێکان ئەترسام کە بمبینن، چونکە هەموو ئەیان ناسیم، بەڵام خەڵکانی نوێژکەر ئەگەر بیشیان بینیمایە وایان دەزانی من فەقێی مزگەوتەکەم و هیچ مەترسییەکم لێیان نەبوو، ساڵ و وەرزەکە کاتەکەی نزیك بوو لە کۆتایی وەرزی بەهار.

بەڵێ کە زانیم حوجرەکە چۆڵەو گڵۆپەکەشیان داگیرسابوو تاکێ لە پەنجەرەی رووکاری حەوشەکەش کرابووەوە، ئیتر بەڕاستی هەل باش رەخسابوو، منیش چاوەکانم کرد بە چەن چاوێ و بە پەلەو زۆر بە گورجی دانەیەك لە (دەنگی فەقێ)یەکەم لە تاکە پەنجەرە کراوەکەوە هاویشتە ناو حوجرەکەوە بێ ئەوەی کەس بمبینێ و پێم بزانێ، ئەمجا خێرا گەڕامەوە، بەڵام بۆ ڕێ گومکێ کردن خۆم کرد بەناو ئاودەستخانەکاندا، وا هات بە خەیاڵمداو وتم نەبادا خێرا بە گۆڤارەکە بزانن و دوام بکەون، ئەمجا دوای

ماوەیەك خۆ خەڵەفاندن لەوێدا بە وریایی و بەهێواشی هاتمە دەرەوەی مزگەوتەکەو بەرەو لای مزگەوتەکەی خۆم گەڕامەوە، جگە لە ئەوەی خانەقاش حوجرەی مزگەوتێکی تریشم لە ئەستۆدا بوو، ئەویشم هەرچی چۆنێ بوو بە ئەنجام گەیاند بێ ئەوەی ماوەی ئەوە بدەم فەقێکانی پێم بزانن، چونکە گەلێ مەترسی هەبوو ئەگەر پێمان بزانرایە؟ لەبەر ئەوەی کە دیار بوو دەرچوونی گۆڤارەکە (دەنگی فەقێ) لەلایەن میرییەوە بەشێوەی ئاشکرا قەدەغە بوو، جا ئەگەر هەر فەقێیەك لەوانەی هاریکاری دەرکردن و بڵاوکردنەوەکەی بکردایەو پێی بزانرایە دەکەوتە بەر پەلاماردانی گرتن و بەند کردنی، وە دەرکردنی گۆڤارەکەش بە کارێکی ناشەرعی و سەرپێچی کردن بوو لە یاسای ئەو رژێمە، بەڵکو هەتا ئەم کارەیان بەجۆرە رێبازێکی چەپڕەو لە قەڵەم دەدا، هەر چەندە لە بنەڕەت و راستی و حەقیقەتیشدا ئەم هەوڵ و تەقەلایە پەیوەندی بە هیچ جۆرە رێکخراوێکی تری رامیاری چەپڕەوی یا راستڕەوی ئەملا و ئەولاوە نەبوو، بەڵکو دەنگی فەقێ تەنها لە بارودۆخێکی تەنگەژەی ژیانی کۆمەڵایەتی فەقێ دەدواو بەس، نیازو مەبەستەکەی لەو رێڕەوەیدا تەنها گۆڕانکاری و بەرەو باش بردنی گوزەران و رێگە خۆشکردنی باشبوونی خوێندن و ژیانی فەقێ بوو، هەم نارەزاییش بوو لە رژێمی ئەو سەردەمەی پاشایی کە هیچ جۆرە گرنگی و بایەخێکی بە ژیانی ئەم توێژە گرنگەی کۆمەڵەی ئاینییە نەدەدا، لەبەر ئەوە وەك کوردەواری خۆمان ئەڵێ: (ئەگەر بە دەستی سەری خۆت

نەخورێنی بە دەستی کەس خرووەکەی ناشکێ.) بۆیەکا هەوڵو کۆششەکە لەناوجەرگەو هەستی خودی فەقێکان خۆیانەوە سەری هەڵداو دەستی پێکرد، خۆیان باش دەردی خۆیانیان ئەزانی، ئێشو ئەشکەنجەی ژیانەکەیان رێ پیشاندەریان بوو بۆ دۆزینەوەی چارەسەری باری گوزەرانەکەیان، دەنگی فەقێ وەك مانگ لە بورجو کەلووی هەستەکانی فەقێوە هەڵدەهاتو دونیای شاراوەی ژیانی فەقێی رووناك دەکردەوەو دەری ەخست، دەنگی فەقێ ئاوێنەیەکی بالاّ روانی گەورە بوو وێنەی ئەرکو ئازاری ناخۆشی ژیانی ئەوانی ئەنواندو پیشانی ئەدا، لاپەڕەکانی یەکبەیەکیان چیرۆکو رازی ئەندیشەی سەختی ژیانو چۆنیەتی باری خوێندنیانی ئەخستە بەرچاوی هەموو فەقێکان خۆیان بە تایبەتیو بەردەم بیرو تێڕوانینی زانایانی ئاینیو رۆشنبیرانو کاربەدەستانی میریش بە شێوەیەکی گشتی، دەنگی فەقێ زمان حاڵی فەقێ بوو، بانگی سکاڵای خۆی ئەدا بە گوێی کاربەدەستانی ئەو سەردەمەی رژێمی پاشایی دا.

دەنگی فەقێ چریکەو ئاوازێکی خۆشو سازگار بوو لە ناخو گەرووی بیروڕای رەوای دەروونی فەقێوە بەرز دەبووەوەو دەنگی دەدایەوە، داوایان وا بوو لەم ژیانی نەبوونیو کوێرەوەرییو ملکەچیو ژێر دەسەییو خونکییو ریابازییو نەزانینو نارێكو پێکی بەرنامەی ئەم شێوازە خوێندنەیان رزگاریان ببیّو ببن بە خاوەنی رای ئازادی خۆیان، تا بەبێ ترسو لەرز بتوانن لە هەموو کاتو لە هەموو کۆڕو کۆمەڵو شوێنێکدا بەرامبەر بە

هەموو كەسێك بەبێ جیاوازیو لە هەموو هەڵوێستێكدا راستگۆو حەق وێژو حەق دووبن، بۆ ئەوەی ببن بە زاناو شارەزای رێبازی راستو رەوانی ئەحكامە شەرعییەكانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

دەنگی فەقێ داوای لە رژێمی پاشایی دەكرد كە خوێندنگەی ئایینیان بۆ هەموو پلەو قۆناغەكانی فەقێیەتی ئامادە بكات، دەنگی فەقێ داوای ئەكرد كە خوێندنو خوێندنگەكانیان رێكوپێك بخرێو پلەو قۆناغی رەسمییان بۆ دابنرێت، داوای دەكرد خوێندنو خوێندنگەكانیان وەك ئەو خوێندنو خوێندنگەیانەی كە سەر بە وەزارەتی زانیاری (معارف)ن نرخو بایەخیان پێبدرێت، بڕوانامەكانیان نرخو بایەخی هەبێو لە فەرمانگە جۆربەجۆرەكانی دەوڵەتدا وەربگیرێنو دابمەزرێن وەك فەرمانبەر، چونكە ئەو بڕوانامەیەی كە ئەو فەقێیانە دوای تاقیكردنەوەی لە (١٢) دوانزە ساڵەكەدا كە وەریان دەگرت هیچ نرخو بایەخێكی نەبوو جگە لەوەی كە تەنها بۆ رزگار بوونیان بوو لە سەربازی كردن، سوودی بۆ ئەوە نەبێ ئیتر هیچ رێزو گرنگایەتییەكی تری نەبوو، داوایان دەكرد كە بڕوانامەكەیان ببێتە سەرچاوەی ژیانیان.

دەنگی فەقێ داوایان ئەوە بوو كە ئەركو خەرجی خۆراكو خەوتنو خوێندنیان لە هەموو پلەو قۆناغەكانی خوێندنیاندا میری بۆیان دابین بكات، لە ژیانو گوزەرانی دەسپانكردنەوەو چاو لە دەستی خەڵكان رزگاریان ببێ، گرێكانی بەربەستی زمانیان یەكە یەكە بكرێنەوە، بە وتەو دواندنی بیرو هۆشو

ژێری دەروونێکی فراوان و ڕەوان و بە ئارامیان هەبێ، لە مەیدانی ڕاستی و ڕەوا وێژێدا زمان و وتارێکی پاراو و ڕەوانبێژییان هەبێ، بە زانین و زانیاری ناخی قووڵی حەقیقەت دەربخەن، پەردەی تەمە مژوتاریکی لەسەر ناڕاستی و نادروستی هەڵبماڵن، بەو بەڵگە عەقڵی و نەقڵییانە ئایینە پیرۆزەکەی ئیسلام بۆ خەڵکانی موسڵمانان لێك بیدەنەوە و لە ناخی بیرو هۆشیاندا جێگیرو چەسپاوی بکەن، وەك لەم بارەیەوە یەزدانی پەروەردگار ئەفەرموێ (واذا تليت عليهم آياته زادتهم ايمانا.) واتە ئەگەر بەڵگە شەرعییەکانیان بۆ روون بکرێتەوە بیرو بڕوایان زیاتر چەسپاو ئەبێ و زیاتر بەهێز ئەبێ، دەنگی فەقێ بەرچاوی فەقێی ڕووناك ئەکردەوە کە پێویستە مامۆستای مەلاچاکی ئاینی و زانا دەرسیان پێ بڵێ، مامۆستای بە توانا و دڵسۆز بە نەتەوەو نیشتمان بێ، سوود بەخش و مرۆڤ ناس و بەرژەوەند بە ویستی گشتی بێ، ئا بەو جۆرە دەنگی فەقێ لە خزمەت بەرژەوەندی فەقێدا ڕێبازی خەباتی گرتبوو، ئەو کێشەو بابەتە ئاڵۆزانەی ڕوون دەکردەوە کە هۆی دواکەوتنی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیرییان بوو.

# چۆنیەتی را و بۆچوونی فەقێکان
# دەربارەی دەنگی فەقێ

لەو سەردەمەدا نوێژی جومعە لە شاری سلێمانیدا تەنها لە یەك مزگەوتدا دەکرا کە ئەویش مزگەوتی گەورە بوو، - مزگەوتی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ- چونکی ژمارەی خەڵکان و دانیشتوانی شارەکە لەو رۆژگارەدا زۆر کەم بوون، وەك ئێستای ئەم کاتە خەڵکەکەی قەرەباڵغ و چڕوپڕ نەبوون کە تەنها مزگەوتێك جێگەی هەموو نوێژکەرەکانی لێ نەبێتەوە تا ناچار بن نوێژی جومعە لە چەن مزگەوتێکی تریشدا بکەن، جا مەبەستەکە ئەوەیە کاتێ فەقێکان بۆ نوێژی جومعە ئەچوون بۆ مزگەوتی گەورە لە گۆشەیەکی حەوشەکەیدا هەموویانت دەبینی کۆڕ و کۆمەڵیان بەستووە، هەموو لەبارەی گۆڤارەکەیانەوە واتە (دەنگی فەقێ) کەوتوونەتە وتو وێژو لێدواندنی، ئیتر باس باسی ئەوە بوو: کە ئەبێ کێ بن ئەوانەی ئەم گۆڤارە دەرئەکەن و بەم شێوەیە هەڵدەستن بە ئەنجام دانی نووسین و بڵاوکردنەوەی؟! بەڕاستی ئەمە کارێکی سەرسوڕهێنەرە و ئەی چۆن پێیان نازانن؟! ئەی چۆن ئەم گۆڤارە بێ ئەوەی بە بڵاوکەرەوەکەی بزانن کەوتووەتە ناو حوجرەکانیانەوە؟! ئەمجا ئەو فەقێیانەش کە دەسیان لە بڵاوکردنەوەکەیدا هەبوو بەشداری وتوریژەکانیان دەکردن! وە لە بارەی پەسەندی گۆڤارەکە و رێنومایی وتارەکانیەوە بە

شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ چۆنیەتی بیروڕاکانیانیان وەردەگرت، لە گەڵیاندا دەکەوتنە دانوستان و دواندن و بەڵگە هێنانەوەی ژیان ناخۆشییان، هەتاوەکو بیچەسپێنن کە شێوازی ژیان و خوێندنیان پێویستی بە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی و بەرەو باش چوون هەیە، ئەمەش رژێمی پاشایی لێی بەرپرسە، بەڵام ئەگەر فەقێکان خۆیان هەوڵ نەدەن و تێنەکۆشن ئەوە ڕژێم لە خۆیەوە هەرگیز هیچ کارێ بۆ کەس ناکات، جا بەڕاستی زوربەی فەقێکان لە ئەم کاروبارەیەوە زۆر سەرسوڕما و بوون و هەم پاڵپشتی گۆڤارەکەشیان ئەکرد، بە کارێکی گرنگ و سوود بەخشیان لەقەڵەم دەدا، وە راو بیریان وابوو کە ئەمە بەرژەوەندی فەقێی زۆر تێدایە. دەبینرا (دەنگی فەقێ) بە دەستی هەندێ لە فەقێکانەوەیە و لەسەر باس و وتارو نووسراوەکانیەوەیە مشت و مڕی وتو وێژیانە و هەر یەکە بیرو رای خۆیشی لەو بارەیەوە دەردەبڕی و هی وایشیان هەبوو پێشنیاری بۆ دادەنا و بەڵگەشی بۆ دەهێنایەوە، وە زوربەیان بێ پەردەی شاردنەوە دەریان دەخست کە پێیان خۆش و چاك بوو باری ژیانیان و هەم باری خوێندنەکەیشیان بەرەو حاڵ و دۆخێکی باشتر بگۆڕدرێ و کێشەکەیان چارەسەرێکی راست و دروست و بنەڕەتی بۆ بکرێت.

بەڕاستی دەنگی فەقێ ناخی هەست و خەیاڵی فەقێیانی ئەبزواند، بیرو هۆشی زانایانی ئاینی و کاربەدەستانی رژێمی پاشایی ئەشڵەژان و ئەشڵەقان، دەنگی فەقێ گوڕو تەوژمی

راپەڕین و هەڵگەڕانەوەیەك (انقلاب)ێ بوو دژ بە ئێش و ئەشکەنجە ستەماوییەکەی ژیانی فەقێ و فەقێیایەتی.

دەنگی فەقێ ڕێبازێکی نوێ و گۆڕانکاری ژیانی فەقێی ڕووناك دەکردەوە، نەواو ئاوازی دەنگی فەقێ تەنها هەر لە شاری سلێمانیدا نەدەدایەوەو بەس، بەڵکو دەنگە خۆش ئاوازەکەی گەیشتە خوێندنگەو مزگەوتەکانی شارەکانی تریش، گەیشتە: کەرکوك، چەمچەماڵ، هەولێر، کۆیە، رانیە، قەلادزە، پێنجوین، هەڵەبجە، تەوێڵە، بیارە... و گەلێ شوێنی تریش.

مامۆستا شێخ کەمالی کوڕی مامۆستا شێخ نوری تەکیەیی پێی وتم: (فەقێکانی کەرکوك لە دوای دەرچوونی ژمارە دووهەمی دەنگی فەقێ پەیوەندییان پێوە کردین، یەك لەوانە (مەلا سەدیق عەبدوڵلا) بوو، کە ئێستاکە ئیمامی مزگەوتی خومخانەیە لە سلێمانی، وە لە کەرکوك جگە لە مەزبەتەو داواکاری (مظاهرة) خۆپیشاندانیشیان کرد بۆ بەجێ هێنانی ئەو خاڵانەی کە کاتی و نانی بوون، بەڵام بە توندو تیژی سەرکوت کران، – مامۆستا ئەڵێ: فەقێکانی هەولێریش لەدوای ژمارە سێهەمی پەیوەندییان پێوە کردین، هەروەها هەندێ لە مامۆستایانی ئاینی بەناوبانگ پشتگیرییان لە کارەکەمان ئەکرد بێ ئەوەی بزانن هەڵسووڕێنەری گۆڤارەکە کێن و چین؟! یەکێ لەوانە زانای بەرزو بەناوبانگ جەنابی مامۆستا شێخ مستەفای قەرەداغی بوو کە پارچە شیعرێکی ناردبوو لە گۆڤارەکەدا بلاوکرایەوە، ئەمەش وەك هاندانێ بوو بۆ فەقێکان کە زیاتر لەسەر ڕێبازەکەیان سوور بن و

بەردەوام بن، هەروەها مامۆستا گۆرانیش کە ئەو سەردەمە سەرپەرشتیاری رۆژنامەی ژین بوو هاوکاری لەگەڵ دەکردین، وە هەندێ هۆنراوە (شیعر) لەبارەی فەقێ و ژیانیەوە لە رۆژنامەی ژین دا بلاو کرایەوە...) دوایی لە مامۆستا شێخ کەمالم پرسی: ئایا ئێستاکە دەربارەی ئەو شیعرانە هیچ ئاگاداری و زانیارییەکی هەیە یا نە؟ وتی: ئێستاکە لە بارەیانەوە هیچ شتێك نازانم.

بەراستی ئەگەر بە وردی سەرنجێ بدەین و توێژینەوەیەکی زانیارانەی بارو دۆخە رامیاری و کۆمەڵایەتییەکەی ئەو سەردەمە بکەین باش بۆمان روون ئەبێتەوە کە هەر ئاکام و ئەنجامی کاریگەری و کاردانەوەو رەنگدانەوەی گۆڤارەکەی دەنگی فەقێ بوو کە رژێمی پاشایی ناچار کرد چۆن لە ساڵەکانی (١٩٥٤)و ساڵەکانی بەدوایدا کەوتە پەلەو دەسپێکردن و دەس دان لە کەمێك لە بارەی گوزەران باشی ژیانی فەقێ و پیاوانی ئاینی، ئەوەبوو لەو ساڵەدا کە (عمر علی) موتەسەریفی لیوای سلێمانی بوو دەورەیەکی یەك مانگی بۆ پیاوانی ئاینی لە فەقێ و مەلا کردەوە دەربارەی چۆنیەتی وانە وتنەوە لەسەر رێبازی سەردەمی تازەو پرۆگرامی وەزارەتی (معارف) ئەمجا لەم بارەیەوە کۆمەڵێکی زۆر مەلاو فەقێ داوایان پێشکەش کردو لە دەورەکە وەرگیران، ئەوانەی کە لە دەورەکە ناجح دەبوون و دەردەچوون میری لە خوێندنگەو دێهاتەکاندا بەناوی وانەبێژی ئاینیەوە واتە (محاضر دینی) دایدەمەزراندن، ئەمەش لەژێر ئەرك و سەرپەرشتی کارگێری خۆیی (الادارە المحلیە)داو هەم

چاودێری و بەرپرسی بەڕێوەبەری مەعاریفی سلێمانیدا، بەکرێ (الاجرة) وانەیان بۆ دانابوون کە بیڵێنەوە، دایان نابوو کە ڕۆژی (٢) دوو موحازەرە بڵێنەوە، یا نابێ زیاتر لە کرێی دوو موحازەرە وەربگرن لە هەموو ڕۆژێکدا با زیاتریش موحازەرە بڵێنەوە، موحازەرەی بە (٢٥٠) فلس بوو، بەڵام ئەوەبوو مووچەی مانگانەکەیان لە (١٢) دینار تێپەڕی نەکردایە، نەدەبوو لەوە زیاتر وەربگرن واتە ئەگەر مانگێکی خوێندن (٢٦) ڕۆژ بوایە موحازەرەکانی ئەیکردە (٥٢) موحازەرە کرێی (٤) موحازەرەی وەرنەدەگرت کە ئەیکردە یەك دینار، بەڵکو ئەوە دەکەوتە خۆڕایی، یاخود ئەگەر مانگەکە لە (٢٦) ڕۆژ کەمتر بوایە بەهۆی عوتلەو پشوو تێکەوتنیەوە ئەو کاتەش (١٢) دینارەکەی وەر نەدەگرت، بەڵکو پارەکەی بە پێی وانە وتنەوەی ڕۆژەکانی مانگەکە بۆی حیساب دەکرا، بۆ نموونە: ئەگەر مانگەکە (٢٢) ڕۆژی وانە خوێندن بوایە کە ئەیکردە (٤٤) موحازەرە ئەوکاتە مانگەکە (١١) دیناری وەرئەگرت، کرێ و مووچەکەیان بەو جۆرە بوو، بەڵێ گەلێ لە بەشدار بووانی دەورەکە دەرچوون و ناجح بوون، منیش یەکێ بووم لە دەرچووانی، لە ئەنجامیدا نێردرامە دێی (نەمەڵ) سەر بە ناوچەی تانجەرۆ، گوندەکە زیار لە (١٠٠) سەد ماڵ دەبوون، لەوە پێش هیچ جۆرە خوێندنگەیەکی ڕەسمی یا نارەسمی تێدا نەبوو، چونکە هەموو گوندەکانی ناوچەکە ئاوها بوو هیچ خوێندنگەیان تێدا نەبوو، من ئەوە یەکەم کەس بووم کە بۆ کردنەوەی خوێندنی سەرەتایی وەك شێوە ڕەسمییەك

کە نێردرام بۆ ئەم گوندەیە، سەبوورەو کتێبو دەفتەرو تەباشیرو قەڵەممبۆ قوتابییەکان لەلایەن بەڕێوەبەری ناوچەی تانجەرۆوە وەرگرت کە ئەو کاتە (محەمەد عیزەت)ی تەل بەڕێوەبەری ناوچەکە بوو، لە هەیوانی مزگەوتی گوندەکەدا وانەم بە قوتابییەکان دەوتەوە لەسەر شێوازو ڕێبازی خوێندنگە سەرەتاییە ڕەسمییەکانی سەر بە وەزارەتی مەعاریف، کە گەیشتمە ئەوێ ناوی زیاتر لە (٣٠) منداڵم نووسیو کردم بە (٢) دوو لیستە یەك بۆ بەڕێوەبەری ناوچەی تانجەرۆ، ئەوی تریشیان بۆ بەڕێوەبەری (معارف) ئیتر لە هەیوانی مزگەوتەکەدا دەستم کرد بە وانە پێ وتنەوەی منداڵەکان، جاری وا بوو خەڵکانی گوندەکە کاتێ دەهاتنە مزگەوت یەکەمجار بوو کە دەیان بینی منداڵەکانیان لەسەر شێوازێکی تازە دەیان خوێند زۆر بەلایانەوە سەیر بوو!! زۆر ناحەقیشیان نەبوو، چونکە لە هەموو گوندەکانی ناوچەی تانجەرۆدا یەك خوێندنگەی تێدا نەبوو، جگە تەنها لە یەك خوێندنگەی سەرەتایی نەبێ کە لە ناوەندی (مرکز)ی ناوچەی تانجەرۆ (عەربەت)دا هەبوو ئەویش تەنها هی سەرەتایی کوڕان بوو، لەبەر ئەوە لەو سەردەمەدا (٩٥٪) زیاتری خەڵکانی کوردستان نەخوێندەوار بوون، بۆ نموونە لەم بارەیەوە پیاوێکی پیری گوندەکە هەبوو برای حاجی حەمە تالیبی سەرۆکی هۆزی مکایەڵی بوو زۆر جاران دەهات لەلامان دادەنیشت، ڕۆژێکیان بینیم ئەگری وتم (مامە غەرە) بەو جۆرە بانگیان ئەکرد خۆی ناوی حەمە غەریب بوو، وتم: بۆچی ئەگریت؟! وتی: جاران کە

منالآن ئەنێردرانە لای مەلا بۆ خوێندن لەپێشەوە پێیان دەوتن: (یـاالله، یافتـاح، یـاڕەزاق) ئێسـتا ئەمـە داراو زارایـەو دەرسـی شەیتانییەو دەرسی ڕەحمانی نییەو لە دینەوە دوورە..) منیش وتم مامە غەرە منالّ بەم شێوازە زووترو ئاسانتر فێری خوێندن‌و نووسین دەبن‌و ئەمەش هیچ ڕێگایەك لە ئاین ناگرێت، وتم فێر بـوونی منـاڵ لـە سـەرەتاوە بـۆ قورئـان زۆر زەحمەتـە چـونکە عەرەبییـەو زمـانی منالّەکـەش نییـەو لـەلای قورسـەو بـە درەنـگ فێری خوێندنـەوەی ئەبێ‌و ماناکەیشـی نازانـێ، وە ئێمە دەرسـی ئاینیشیان پـێ ئـەڵێین بە ئاسانی‌و بە کوردی بە زمانی خۆیان، ئەمجا لەم بارەیەوە لە منالّەکانم پرسی: بنچینەی باوەڕ چەندە؟ هـەموو دەسـیان هـەڵبڕی وتیـان (٦) شەشـە لـە یـەکێکی تریـانم پرسی بیان ژمێرە وتی: ١- باوەڕ بە خوا، ٢- بە پێغەمبـەرانی، ٣- بە کتێبەکانی.. تادوایی، لە یەکێکی ترم پرسی، شایەتیمان بڵێ‌و ماناکەشی بڵێ بەباشی وەلآمی دایەوە، ئەمجا پێم وت تۆ وەك ئـەو منالّـە ئـەوە ئـەزانیت؟ وتـی: نـەوەڵلا...، ئا بـەو جـۆرە مەسـەلەکەم تێگەیانـدو پێم سەلماند کە ئەو بە هەڵە لە شتەکە گەیشتووە.

ئەمجا ئەوەی کە گومانی تێدا نییە دەربارەی ئەم کارەی ڕژێمی پاشـایی کـە بـەم جـۆرە پێـی هەسـتا بـە کردنـەوەی ئـەم جـۆرە دەورانە بۆ پیاوانی ئاینی لە پشـوەکانی هاویندا هەر گوشاری بـەهێزو کاریگـەری گۆڤارەکـەی دەنگـی فـەقێ بـوو کـە ڕژێمـی پاشایی وەك وتمان بە پەلە پێی هەڵسا و ویستی چارەسـەرییەکی

کاتی بارو دۆخە ئاڵۆزەکەی ناو فەقێکانی پێ خاوو هێواش بکاتەوە، چونکە رژێم باش دەیزانی و مەترسیشی لە بیرو باوەڕو نیازی ئاینی زۆر هەبوو کە ئەمە ببێتە هۆی پەرەسەندن و جۆرە ئاڵۆزییەك کە رێکخراوە رامیاری (سیاسی)یە نهێنییەکانی تر بتوانن ئەم دۆخە بە هەل بزانن و دەستی تێ وەربدەن و داغش و پێشڕەوی بکەن تا لە ئەنجامدا ببێتە هۆی راپەڕین و هەڵگیرساندنی شۆڕش و سەرنگوم کردنی دەسەلاّت و رژێمەکەی، دیارە هەر لەبەر ئەمە بوو کە رژێم بە پەلە ئەم پرۆژە چارەسەر کاتییەی هاوردە ناو مەیدانەوەو بوو بە هۆی خاو بوونەوەو دەمکوت کردنی هەندێ لە پیاوانی ئاینی و فەقێکانیش، هەم بوو بەهۆی خۆ خەریك بوونی بیرو هۆشیشیان بە نواندنی ئەو تۆزە مووچەو گوزەرانەوە، هەروەها لەبیرخۆ بردنەوەی تەنگ و چەڵەمەی بارودۆخە بنەڕەتییە ناخۆشەکەی ژیانیان و کپ کردنەوەی بزووتنەوەکەیان، لەڕاستیشدا بەم پرۆژەیە بزووتنەوەکە کپ کرایەوە، چونکە ئەم توێژە ئاینییەی کۆمەڵ لە ژیانێکی زۆر ناهەموارو سەختدا دەژیا، بە پیشاندانی ئەو تۆزە ژیانە تا رادەیەك هەڵوێستیان وەرچەرخا و دەنگیان کپ بووەوە.

بەلاّم بەهەر حاڵ هەرچۆنێ بوو، بوو، بەلاّم با ئەم رووداوە راستییە مێژوویینەی دەنگی فەقێ لەسەر لاپەڕە پرشنگدارو زێڕینەکانی مێژووی خەبات و ژیانی فەقێ و مرۆڤایەتی بە تیشکی لێدوان و رووناك کردنەوەی بە زانین و زانیاری هەمیشە لە گەشانەوەدا بێ و سەرەو لێژی ناو چاڵی قووڵی تاریکی نەزانین و

فەرامۆش کردن نەبێ، لەلای زمانو لاپەڕەکانی مێژوویش دەنگی کپ نەبێو ڕەنگی زێڕین بێ، بەخاکساری لەبیر چوونەوە دانەپۆشرێ، ڕواڵەتی ئاسەواری ون نەبێ، بەڵێ دەنگی فەقێ زەمینەیەکی لەبارو چاکی سازانو گۆڕانکارییەکی گرنگی خستە بەرچاو دەربارەی بیروڕای ژیانی فەقێ لە کوردستانی عێراقدا بە تایبەتی هەتا بە شێوەیەکی گشتیش لە عێراقدا، پلە بە پلەو هەنگاو بە هەنگاو بە ئاشکرا باش دەبینرا ئەم کارە بەرەو وریا بوونەوە ترو بەرەو پێشکەوتن تر دەچێو ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر تاریکیو تەمە مژی بەرچاوی ژیانی فەقێی ڕادەماڵیو بەردەمی ڕووناك دەکردەوە، هەتا گەیشتە ئەو پلەو ڕادەیەی کە لە ئەنجامی هەوڵو تێکۆشانی فەقێو دەنگی فەقێدا زوربەی فەقێکان لەکاتی تاقیکردنەوەی سەری ساڵی ئەو ساڵەی (١٩٥٣)دا سکاڵایەکی گرنگیان دا بە کاربەدەستانی ڕژێمی پاشایی، داوایان ئەوە بوو کە (امتحان) نادەن هەتاوەکو میری بڕیار نەدا لەسەر بەجێهێنانی خاڵەکانی داواکەیان کە لە سکاڵاکەیاندا نووسراوەو ڕوونکراوەتەوە، داواکەش بە چەند نوسخەیەك ڕێکخرابوونو دانرابوون، یەکەم بۆ بەڕێوەبەری ئەوقافی لیوای سلێمانی، دووەم بۆ موتەسەریفی لیوای سلێمانی سێیەم بۆ سەرۆك وەزیرانی حکومەتی عێراق لە بەغدا، چوارەم بۆ وەزارەتی ئەوقاف لە بەغدا، ئەمەش کە لە دواوە دێ هەندێکە لەو خاڵانەی داواکانیان کە لە سکاڵاکەیاندا هاتبوو:

١- کردنەوەی خوێندنگەی رەسمی ئاینی بۆ فەقێکان بۆ هەموو پلەو قۆناغەکانی ئاینی وەك: أ- پلەی سەرەتایی، ب- پلەی ناوەندی کە ئەم دووانەیان پێویستە لە لیواکانی عێراقدا بکرێنەوە، جـ- پلەی بالآیی- زانکۆیی- ئەمەیان لە بەغدای پایتەخت بێ.

٢- رێکخستن‌و دانانی مەنهەج‌و بەرنامەو کتێبی تایبەتمەند بۆ هەر سێ قۆناغەکانی خوێندن.

٣- دابەشکردنی کتێب‌و دەفتەرو هەموو پێویستییەکانی خوێندن بەسەر خوێندکارو فەقێکانی هەر سێ قۆناغەکاندا بە خۆرایی.

٤- کردنەوەی شوێنی (داخلی) بۆ خەوتن‌و خواردن‌و ئەرکی ژیانی ئەو فەقێیانەی کە خەڵکی شار نەبن پێویستە میری بۆیان دابین بکات.

٥- مامۆستاو وانەبێژی زاناو بەتواناو دڵسۆز بە وانەو ئاین‌و نەتەوەو نیشتمان دەرسیان پێ بڵێت.

٦- بڕیاردان بە نرخ‌و بایەخدان بە بڕوانامەکانیان بۆ مەبەستی دامەزراندنیان لە فەرمانگە تایبەتمەندییەکاندا لە دوای دەرچوونیان لە خوێندنگەکان... هەروەها چەند خاڵێکی تریش، بەلآم هەر کە ئەو سکاڵاو داوایە کەوتە بەرچاوی هەندێ لە کاربەدەستانی ئەوقاف‌و کارگێڕی خۆیی (الاداره المحلیه)و هەروەها بەرچاوی ئەو مامۆستاو وانەبێژە ئاینییە رەسمیانەو هەندێ لەو فەقێیانەش کە سەر بەو مامۆستایانە بوون ئەمە

کاردانەوەیەکی ناکۆکیو دژایەتی لەناو فەقێکاندا هەڵگیرسان، چونکە ئەم داوایە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ رەخنەو نارەزاییش بوو لەو مامۆستاو وانەبێژە ئاینیە رەسمییانەش، لە بەر ئەوەی کە دەیانزانی ئەم کارە لە دژی بەرژەوەندی ئەوانە، چونکە ئەگەر داوای فەقێکان سەری بگرتایەو ئەنجام داری باشی بووایە دەبووە هۆی گۆڕانکاری مەنهەجو خوێندنی فەقێکانو هەم لەگەڵ دەستکاریو گۆڕانی هەندێ لەوانە بێژەکانیش، ئەمەش زیانێکی ناهەمواری بە ژیانی ئەوان دەگەیاند، لەوانە بوو زۆربەیان وەزیفەی وانە بێژییە رەسمییەکەیان لە دەس بچوایەو ئەمجا مووچەکەشی نەدەما، چونکە هەندێکیان لە خەمی مووچەکەی خۆیان بەولاوە هیچ ناخۆشیەکی ژیانی فەقێکانیان لا مەبەست نەبوو، ئەم هۆیە بوو کە ئەم مامۆستایانە کەوتنە تێزەدانو هاندانی هەندێ لە فەقێکان بۆ بەرەنگاریو بەرهەڵستی سەرنەگرتنو پووچکردنەوەی ئەم هەوڵو تەقەلای داوا راستو شەرعییە زۆرینەی فەقێکان، ئەم کارە دووبەرەکیەکی ناخۆشی لەنێوان فەقێکاندا نایەوە، تاقمێک فەقێیان پێک هێنا دژ بەو فەقێیانەی داواو سکالاًیان دابوو بەمیری، ئەمجا ئەو کۆمەڵە فەقێیە دیارە بە پشتیوانی ئەو مامۆستایانەو هەم میریش کەوتنە هەرەشەو گوڕەشەی بەگژا چونی فەقێکانو میریشیان لێ پڕ کردن، لە ئەنجامدا توانیان کارەکە بە سەریاندا بشکێننەوەو ناچاریشیان کردن بەوازلێهێنانو بێدەنگ بوون لە داواکەیانو ملکەچیش کران بۆ (امتحان) دان... بەلاًم دوای تەواو بوونی

تاقیکردنەوەکە (امتحان) دان میری کەوتە ویزەو گەڕان و تاقیب بەدوای ئەو فەقێیانەی کە ئیمزای سکالاکەیان کردبوو، ئەمجا لەبەر ئەوەی ئەو فەقێیانەی کە بێ ئەرخەو بێ پشت و بێ پەناو واسیتە بوون کەوتنە بەر مەترسی پەلاماردان و گرتن و دەس لێ وەشاندن و جێ پێ لێژکردنیان لەلایەن میریەوە، بەلام ئەمانیش وەنەبێ هەر وا کەمتەرخەم و بێئاگاو دەسە پاچەو دەسەوسان بن بەرامبەر نیازی خراپ و فێلاوی میری، بەلکو هەر زوو ئاگادار کران و ناچار بوون کە خۆیان لە بەر چاو ون بکەن و هەر یەکەو بە لایەکدا پەرتەوازە بوون و لە ناو شار دەرچوون، بەلام مامۆستا شێخ کەمال لەلایەن موتەسەریفی سلێمانیەوە (عمر علی) گیرا، ئەمەش بوو بەهۆی وەستانی دەرچوونی گۆڤارەکەی (دەنگی فەقێ) ئەمجا ئیتر مامۆستا محەمەدی مامۆستا مەلا کەریمیش نەیتوانی بەردەوام بێ لە سەر هەلسوڕاندن و دەرکردنی، لە هەمان کاتیشدا زۆربەی کادیرەکانی بلاوەیان لێ کردو لە بەرچاو ون بوون و دوورکەوتنەوە، مەلا علی جوانڕۆیی کە لە پێشەوە باسمان کرد بەرەو ناوچەکەی خۆیان هەلات و خۆی رزگار کرد، بەلام بەداخەوە هەر لەو سالانەشدا بیستمان کە کۆچی دوایی کردووە، مەلا علی (توتا قاج) یش کە ئەمیش یەکێك بوو لە کادیرەکانی خۆی دەرباز کردو لە شار دەرچوو، منیش نووسەری ئەم نامیلکەیە.. بەرەو کەرکوك بۆی دەرچووم، یەك دوو مانگێ لەوێ مامەوە، بەلام ئەوێم بەدڵ نەبوو، دوایی بیستم کە لە خوێندنگەی قزڕەبات (خەسرەواباد) جێگە هەیە ئیتر لەگەڵ

فەقێیەکی ترا کە ناوی مەلا فاتیح بوو خەڵکی گوندی (قەیتول)ی سەر بەناوچەی قادر کەرەم بوو پێکەوە هەردوکمان چووین بۆ ئەوێو لە مزگەوتی (محمود پاشای جاف) گیرساینەوەو جێگەمان دەسکەوت، بەڵام زۆر بەداخەوە دوایی کەمن بەیەکجاری لەوێ گەرامەوە بۆ سلێمانی بیستم ئەم مەلا فاتیحە کە لەوێ مایەوە لە ئاوی سیرواندا دەخنکێ، من نزیکەی (٥-٦) مانگ لەوێ مامەوە، دوایی هەواڵم زانی کە گرژیو ئاڵۆزی بارو دۆخەکە خاو بووەتەوەو ئەو مەترسیو توندو تیژیەی نەماوە، لە ئەنجامیدا لە پایزی ساڵی ١٩٥٣دا هاتمەوە بۆ سلێمانی، و لەمزگەوتی مامۆستا شێخ بابا عەلی جێگام دەست کەوت، لە خزمەتی مامۆستا شێخ نوریدا (جمع الجوامع)م ئەخوێند لە (اصولی فقه)دا، ئیتر لە خزمەتیا مامەوە تا پاییزی ساڵی ١٩٥٤ ئیتر منو مەلا کامیلی کوری مامۆستا مەلا نەزیری تەوێڵەیی هەردووکمان پێکەوە لە خزمەتی مامۆستا حاجی شێخ نوری شێخ بابە عەلی تەکیەییدا ئیجازەمان وەرگرت، هەر لە هاوینی ئەمساڵەشدا بوو کە هەر(عومەر علی)ش موتەسەریف بوو، لەو رۆژگارەدا لە بری پارێزگار دەوترا موتەسەریف.. دەورەکان کرابوونەوە بۆ پیاوانو فەقێیانی ئاینی منیش یەکێ بووم لە دەرچووەکانیو، چاوەڕێی ئەوە بووین فەرمانی بڕیاردانی دامەزراندنمان دەربچێت، لە ئەنجامدا دوای دەرچوونی فەرمانەکە من دامەزرام بە وانە بێژی ئاینی (محاضر دینی) لە دێی (نەمەڵ) سەر بەناوچەی تانجەرۆ، وەك لە پێشەوە باسم

کـرد، هــەروەها دەرچــووانی دەورەکــە هــەموویان نێــردران بــۆ گوندەکانی دەرەوەی شاری لیوای سلێمانی بە ناوی وانە بێژی ئـاینی (محاضــر دینــی) بـەم ناوەیــەوە نـاو دەبـران، (لیـوا) لـەو سەردەمەدا بەواتای (پارێزگا) بوو، بەڵێ ئا بەو جۆرە کۆتـایی بە تەمەنی دەرچوونی (دەنگی فەقێ) هات، بەڵام با ئەوەش بوترێ: بەراستی دەنگـی فـەقێ و کاریگـەری دەنگی فەقێ هـەر چـەند لـەو ماوەیەدا کپ و بێدەنگی تووش هات بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مۆرك و ئاســەواری نەکوژایــەوەو نەکەوتــە نـاو نـاخی چـاڵی فـەرامۆش کردنــەوە، بــەڵکو هــەتا دوای شۆڕشــی (١٤) تــەمووزی ســاڵی (١٩٥٨)یش بـە سـەرکردایەتی زەعیم (عەبدولکـەریم قاسـم) ئـەم ســەردەمەی ئــەمیش بــاش ئاگــادار بــوو لــە چەشــتنی ئــێش و ئەشـکەنجەی گـوزەرانی ئـەم توێـژە ئاینییـەی گـەلی عێـراق وەك توێژەکانی تری، چونکە باری ناخۆشی ژیانیان بەشێك (جوزئێ) بـوو لـە ئێش و ئـازاری ژیـانی گـەلی عێـراق بەگشتی، کـە ئەمانـە بـوون، بوونــە هــۆی بــەرپا بــوون و هەڵگیرســاندنی شۆڕشــەکەی (١٤)ی تەمووزو سەر نگوم کردنی رژێمی پاشایی، بەڵێ دیار بوو کە ئەم شۆڕشە بێ ئاگا نەبوو لە خەباتی هەموو توێـژەکانی گـەلی عێراقـی و بڵاوکـراوە نهێنییــەکانی رێکخراوەکانیشــی، بــەڵکو لــە ئەمانــە هــەمووی چـاك ئاگـادار بـوو، ئاگـای لـە هــەموو پارچــەو بوارەکانی گـەل هـەبوو، کە پارچەیەکیشیان خـەبات و تێکۆشـانی پڕ لە شانازی دەنگـی فـەقێ بـوو، کـە دلێرانە ئەتەقیـەوە بـە رووی زۆری سـتەمکاراندا، هــەر ئــەو کاریگــەری و کارلێکردنــەی دەنگــی

فـەقێ بـوو کـە رابـەرانی شۆڕشـی تـەمووزو فـەرمانرەوایانی نیشـتمانی گرنگـی بـدەن بـەم کۆمەڵـە ئاینییـەی گـەلی عێـراق و ئاگادارین کە لەچی ژیانێکی سەخت و ناهەمواریدا دەژیان!! هەر لـە بـەر ئەمـەش بـوو کـە هەوڵیانـداو بڕیاریانـدا بـە کردنـەوەی دەورەیـەکی رەسمـی یـەك ساڵەیی بۆ پیاوان و فەقێیانی ئاینی ئـەویش سـاڵی(١٩٥٩-١٩٦٠) بـوو، بێگومـان ئەمـەش بەرهـەم و دەسـکەوتێکی خـەباتی گـەلی عێراقـی بـوو بەگشـتی، وەهـەوڵ و تەقـەلای ئـەم توێـژە ئاینییـەش بـوو بـە شـێوەیەکی تایبـەتی، دەورەکـە لـەم شـارانەدا کرایـەوە، (بەغـدا، نەجـەف، سـلێمانی، هـــەولێر.) بـــەڵام پـــێش وەرگـــرتن لـــە دەورەکـــە (اختبـــار) تاقیکردنەوەیەکیان بۆ وەرگیران لە دەورەکە دانابوو، ئەوەی لەو تاقیکردنەوەیە (اختبار)ە دەرنەچووبایە لە دەورەکە وەرنەدەگیرا، ئـەم تاقیکردنەوەیـە گوایـە بـۆ ئـەوە بـوو کـە بزانـرێ شـییاوو ئەهلیـەتی وەرگرتنـی هەیە، جێگای تاقیکردنەوەکەش تـەنها لـەم دوو شـارەدا بـوو: (بەغـدا، هـەولێر). مامۆسـتا شـێخ کـەمالی مامۆستا شێخ نوری کە لە پێشـەوە باسمـان کـرد، یـەکێك بـوو لەوانـەی کـە رۆڵـی گـرنگ و سـەرەکی دەبینـی لـە دەرکـردن و هەڵسـووراندنی گۆڤارەکـەی (دەنگـی فـەقێ)و وریـا کردنـەوەی هەسـتی فـەقێ لـەم کـاتی کردنـەوەی دەورەیـەدا ئیمـامی مزگەوتەکـەی خۆیـان بـوو.. مزگـەوتی شـێخ بابـە عـەلی.. بـەڵام مووچـەی ئیمـام و زۆربـەی پیـاوانی ئـاینی لـەو سـەردەمەدا وەهـا نەبوو بەشی ژیـانی خـاوو خێـزان دابین بکـات لە بەر ئـەوە ناچـار

بوو چووە دەورەکەوە، لە تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵدا بە یەکەم‌و لە سەری ساڵیشدا بە دووەمی دەورەکە دەرچوو، بەڵام بەداخەوە لەگەڵ ئەو هەموو خزمەت‌و هەوڵ‌و ئەرك‌و ستەم دیدەیەشی کەچی هەر ناحەزان‌و کۆنە پەرستان‌و دوژمنانی راستی‌و زانیاری لەم کات‌و سەردەمی کۆمارییەشدا کە گەلی عێراقی چەردەیەك هەوای ئازادییان هەڵدەمژی وازیان لێ نەهێناو بەدزە لێی کەوتنە کنەو نەیان هێشت ماف‌و رەوای دامەزراندنی خۆی وەر بگرێ، تا لە رێگەی پەروەردەی زانیاریەوە بتوانێت خزمەت بەرۆڵەکانی نەتەوەکەی بکات، لە بەر ئەوە بۆیان تێچاند بوو نەیانهێشت دابمەزرێ، هەروەها من‌و چەند فەقێیەکی تریش نزیکەی (٢٠) کەسێ دەبووین لەدەرچوانی دەورەکە لەوەجبەی یەکەمدا دانەمەزراین، بەڵکو بۆ ماوەی هەفتەیەك دوا خراین، وادیار بوو بۆ ئێمەشیان تێچاندبوو، تێچاندنەکەش دیار بوو هەر لەلایەن ئەو لایەنانەوە بوو کە دژایەتی گۆڕانی ژیانی فەقێیان دەکرد وەك لە پێشەوە باسکرا، کەچی سەیر لەوەدا بوو: کە هەر ئەوانەی کۆسپ‌و بەرەنگار بوون لە رێگای سەر نەگرتنی داوای فەقێکان‌و دژی گۆڤارەکەی دەنگی فەقێ وەستان‌و ئەوانەی سەر بەخزمەتی رژێمی پاشایی بوون ئا ئەوانەی ئەمرۆش لەم سەردەمی شۆرش‌و حکومەتی(عەبدولکەریم قاسم)یشدا دیسان لە ژێرەوە کەوتنەوە دژایەتی هەندێ لە فەقێکانی دەورەکە، هەر ئەوانیش بوون ئێستاکەش لە ریزی پێشەوە سنگیان دەردەپەراند، چونکە ئەوان لەوەجبەی یەکەمداو حەفتەیەك لە

پـێش ئێمـەدا دامـەزران! جا بەراسـتی لێـرەدا ووشـەیەکم هەیـەو بەشـێوەیەکی گشـتی باسـی ئەکـەمو مەبەسـتم کەسـی تایبـەتی نییە، لە بنـەڕەتو راستیدا ئەم جۆرە رەفتارانـە (ناراسـتیو هـەل پەرسـتیو کینـەو بێبـاریو دووڕوویـیو خـونکی.. هتـد) جـۆرە رووخێنـەری کۆمـەڵن، گـەورەترین زیـان بەخشـن بـە نەتـەوەو نیشـتمان، هـەر کۆمەڵـەو نەتەوەیـەك لـە سـەر بنچـینەی راستیودڵسـۆزیو هاوکـاریو تـەباییو رەوشـت بـەرزی دانەمەزرێت ئەوە هـەرگیز ئاکامو ئومێدی بۆ کۆشکی ئازادیو شکۆی سەربەرزی نەتەوەکەی نـەمێنێ. ئـەوە دەبێتـە هـۆی لـەتو پـەت بـوونی گـەل، دەبێتـە خۆرەیـەك لـەژێرەوە بـەردی بنچینەی قـەڵای یـەکێتیو ئـازادیو ژیـانی مرۆڤایـەتی دەردەهێنـێو هەرەسـی پـێ دێنـێ، چـونکە نەتـەوە، دەوڵـەت، کۆمـەڵی پێشـکەوتوو بەختـەوەر مرۆڤایـەتی بریتییـە لـە رەوشـت بـەرزی راسـتی برایـەتی دڵسـۆزی یـەکتری هەماهـەنگیو یـەکێتیو یـەکگرتنی هـەموو توێـژو چـینە نەتـەوەییو ئـاینیو نیشتمانییەکان کـە ئەمـە سەرچاوەی بەرژەوەنـدیو بەختـەوەری هـەر هـەمووانی تێدایـە بـەبێ جیـاوازی، ئـەم رەوشـتە بەرەیەکـە دەبێتـە چـیایەکی پـۆڵایینو سـەرکەش بەرامبـەر دوژمنـانی ستەمکارو تەماعکار، هەروەك شاعیری میسری کـە وا بـاوە رەگـەز کوردیشـە ئەحمەد شەوقی لەم بارەی ئەم بێ بارییـەوە ئەفـەرموێ:

(وانما الامم الاخلاق ما بقيت --- فأن هم ذهبت اخلاقهم ذهبوا) جـا بەداخـەوە لـە سـەردەمی پاشـاییدا هەنـدێ کەسـانی

نالـەبارو بـێ بـار هـەبوون هاوكـارو پشـتگیرو چاوسـاغو دەس راكێشـەری سیخوڕەكانی بـوون بـۆ سـەر گیـانی هـاو نەتـەوەیی و هاوڵاتییـەكانی خۆیـان، بەمـەش خزمـەتی چـاكی بەرژەوەنـدی بێگانـەیان دەكـرد هـەتا لەسـەر خزمو كـەس‌وكاری خۆیانیشیان، هـەروەها لەسـەر خـەڵكانی راسـتخوازو ئـاین راسـتو نەتـەوە پـەروەری دژی سـتەمو سـتەمكار، جـا ئـەم رەفتارانەشـیان وەك روونو ئاشكرا بوو وە نەبێ لەپێناوی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا بووا، بـەڵێ لـە راسـتیدا لـەم پێنـاوە پیرۆزەدا نـەبوو، چـونكە لـە هـەردوو سـەردەمەكەدا – چـی پاشـایی یـا كۆمـاری- هـەر هـەمان نۆكـەرییان دەبینـی، بەڕاسـتی جێگـەی سـەمەرەو سەرسـوڕمان بوون! بـەڵكو كەواتـە وەك دیـار بـوو كەسـانێ بـوون تـەنها بـەرۆكو سـنگیان پـڕ بـوو لـە ژەنگـی گومـانو حەسـادەتو خووڕەوشـتی نزمو دزێو، هەموو تەقەلایان دەسكەوتێكی مادیو مادە پەرستی خۆیان بوو، وایـان گومـان دەبـردو دەزانـی كەسـانێ هـەن بوونەتـە كۆسـپو رێگـر لـە بەرژەوەنـدیو ژیـانی ئەوانـدا، بـەوجۆرە لـەناو زەلكاوی گوماندا خنكاو بوون. بەڕاستی كەچی سەیر لەوەدا بـوو وەك لـە پێشـەوە وتم لەسـەردەمی كۆماریشـدا زوربـەیان خـراپتر رۆڵـی سـەردەمی پاشاییان دەبینـی، سـەرلەنوێ كەوتبوونـە سـەر رێچكەی خونكی بازی وریابازیو هەلپەرستیو دژایـەتی هەنـدێ لـە هاوەڵـەكانی خۆیـان، لـە دژی ئـەو كەسـانەی كـە بەڕاسـتیو بـە دڵێكـی بـێ گـەردەوە لـە پێنـاوی بەرژەوەنـدی هـەموان بەگشـتی تێدەكۆشـان بـۆ بـەرز بوونـەوەی ئاسـتی رونـاكبیری فـەقێ بـۆ

وەچنگ خستنی ژیانێکی پڕ لە عیززەتی نەفس و سەر بەرزترو ڕێبازگەیەکی شیاوو باشتر بۆ وەرگرتنی فێربوون و زانین بۆ هەموو فەقێکان بە گشتی و بەبێ جیاوازی، هەر هۆی تێکۆشانەکەی ئەمانیش کردنەوەی ئەم دەورەیەی هێنایە ئەنجام، بە کورتی هەموو هەوڵێکی ئەم کۆمەڵە فەقێ روناکبیرانە ئەوە بوو بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی هەردوو (دۆخی ژیان و زانست)ی زانایانی ئاینی بوو، بەڕاستی ئەمەش دوورە لە کەسانێکی بەد رەفتارو موتەمەللیق و خونکی بازی دەربەس نەهاتووی (قیم)و رەوشت بەرزی و بیروباوەڕی راست و دروست، بەلام با ئەوەش فەرامۆش نەکەین کە باس و خواس و لێدوان لەم کردەوە دزێوانە درێژە زۆر دەخایەنێ و لێرەشدا جێگەی ئەوە نییە، وەك کوردی خۆمان ئەڵێ: (ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێ.) بەلام لێرەدا بەم دوو بەیتەی ئیمامی عەلی (ر.خ) بێ، کە دەربارەی ئەوانە چی فەرمووە کۆتایی پێ ئەهێنم.

(واحذر ذوي الملق اللئام فانهم  في النائبات عليك ممن يخطب
يسعون حول المرء ما طمعوا به  واذانبا دهر جفوا وتغيبوا)

جا لێرەدا ئیمام روو دەکاتە ئەوانەی کە باوەڕێکی راست و دروست و دەروونێکی پاك و بێ گەردو رەوشتێکی بەرزیان هەیە روویان تێ دەکات و ئامۆژگارییان دەکات و ئەفەرموێ:-
ئەوانەی هەلپەرست و بێبارو چرووك و دوو روون لێیان بە ئاگابن، لێیان دڵنیا مەبن، چونکە لە کاتی تەنگانەو ناخۆشیتا نەك نایەن بە هاوارتەوەو نەك هەوڵیش نادەن بۆ رزگار بوون و بار

سووكيت بەڵكو پەژارەو ئازارەكەت گرانتر دەكەنو دەسدەكەن بە لێ خوێندنتو چی كردارو وتاری ناپەسەنو دزێوو ریسوا هەیە بۆت هەڵئەبەستنو بڵاوی ئەكەنەوە.

هەلپەرستانیشیان لەو بارو رادەیەدایە: كەچی كەسێ، یان چی تاقمێك لەوانە بێ كە جێگەی سوودو تەماعو دەسكەوتی ئەوان بێ دەكەونە رووپەرمایی و پیاهەڵدانو خونكی كردنو خولانەوە بەدەوریدا، ئەم خونكیو چەرخەو خولەشیان تا ئەو كاتەیە كە دەسكەوتەكانی ئەمانیان لابێ، بەڵام هەر كاتێك كە زانییانو هەستیان كرد ئەو كەسە یان ئەو كۆمەڵە رۆژگار رووی لێ وەرچەرخاندووەو كەوتۆتە بەر زللەی سەختو بە ئازاریو ئیتر سوود بەخشی ئەمانی لەلانەماوە ئەو كاتە ئەبینێ نە بەڵێن ئەزانن واتای چییە؟! نە پەیمانو وەفا ئەزانن سەروبەری لەكوێوەیە؟! ئەنجا پشتی تێ ئەكەنو لێی دوور ئەكەونەوەو خۆیانی لێ ون ئەكەن!!!.

مەحمود عەزیز حەسەن

١٩٨٦/٣/١٠